(پێناسەی پەرتوك)

ناوی پەرتوك(ناسینی ئەلبانی لە رێگەی فەتواو گوتارەکانی)

نووسەر: عبداللە عاڵلآیی

پیتچنین:پرۆژەی ( گەیلانی)

بابەت:ئاینی

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١١م



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی( ١٤١ )ی ساڵی٢٠١١ی دراوەتێ

# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحیم

## الحمد لله ،والصلاة والسلام علی رسول الله ،وعلی اله وصحبه ومن والاه.

خوای تبارك وتعالی لە قورئانی پیرۆز فەرمویەتی(کنتم خیر امة اخرجت للناس تامرون بالمعروف وتنهون عن المنکر)سورةءال عمران.

وە حەزرەتی رسول الله (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(من رأی منکم منکرا فلیغیره بیده فإن لم یستطع فبلسانه فإن لم یستطیع فبقلبه وذلك اضعف الایمان)رواه مسلم.

ئیمام ابو علی الدقاق دەفەرموێ(الساکت عن الحق شیطان أخرس)

ئیمامی بەیهەقی لە پەرتوکی(مناقب الشافعی)ریوایەتیکردوە کە ئیمامی شافعی(رحمه الله)هۆشداری داوە سەبارەت بە(حفص)و بەرامبەر کۆمەڵێ پێی گوتوە(لقد کفرت بالله العظیم)لسان المیزان١/١٨٢

هەروەها ئیمامی ئەحمەدی کوری حەنبەل (رحمه الله)لە سەردەمی خۆیدا جەرحی (محمد بن اسحاق)ی دانەری پەرتوکی(المغازی)کردووە ،دەربارەی فەرمویەتی : ( کذاب)تهذیب التهذیب ٩/٤١.

لەژێر رۆشنایی ئەم دەقانەی سەرەوە، لەوەدەگەین کە ئاگەدارکردنەوە و وەلأمدانەوەی ئەهلی بیدعە پێویستیەکی

شەرعییە،هەروەها باسكردنی هەڵـە و پەڵـە یـاخود رسـوایییەكانیان ناچـێتە خانـەی غەیبـەتكردن :رسـول الله (صـلی الله علیـە وسـلم) هۆشداری داوە بەوەی كە فێل و ساختەكاری لە خواردن دەكات جـا جچای ئەو كەسانەی فێلّ و ساختە لـە دیـن دەكـەن ، هـەر لـە زووە زانایانی رەبـانی وەلاّمـی ئـەهلی بیدعـدیان داوەتـەوە ،ئەوەتـە حجـە الاسـلام ئیمـامی غـەزالی(رضـی الله عنـە)زۆر بوێرانـە وەلاّمـی بیدعەچـییەكانی داوەتـەوە و ریـسواییەكانیانی بـۆ موسـڵمانان ئاشكراكردوە،گەر چاوێك بە كتێبخانـەی ئیسلامیدا بخشێنیت ئـەو راستیەت بۆروندەبێتەوە كە كتێبە وەلاّمییەكان پانتیاییـەكی فراوانییـان لـە پەرتوكخانەی ئیسلامی داگیر كردوە ،ئێمەش بە پشت بەسـتن بـەم دەقانەی سەرەوەو دەیان دەقی تری لـەم شـێوە و بـە شـوێنكەوتنی رێبـازی گـەورە زانایـانی ئـەم ئومەتـەی ئیـسلام هـەر لـە سـەرەتای ئیسلامەوە تاكو ئـەم سـەردەمە ،ئـەم پرۆژەیـە رادەگەیـەنین و پـشت بەخوا دەبەستین،ئامانجی ئـەم پرۆژەیـە وشـیاركردنەوەی موسـڵمانانی خواناسی كوردستانە لە گەندەڵی و ریسوایی رێبازی بیدعەچییەكان ، وە وەلاّمدانـەوە ی شـوبهە و بەڵگـە چـەوتەكانیان، بەتایبـەت (وەهابییـەكان)كـە ئێـستا بـۆ پێكـانی بەرژەوندییـەكانی خۆیـان پاشگری(سەلەفییان)بۆخۆیان هەڵبژاردوە، گرۆهـی بیدعەچـی زۆرن هەندێكیان هەر لـە زووەوە سـەریان هەڵـداوە تـاكو ئێـستاش مـاون

وەك(رافیزییەکان و موعتەزیلییەکان هەندێ گرۆهیتر) وە هەندێکیان گرۆهی سەردەمن و لەم سەدانەی دوایی سەریان هەڵدا وەك(قادیانییەکان ،بەهائییەکان،وەهابییەکان)کە ئەم سێ گرۆهە بەدەستی ئینگلیز دروستکران بۆ روخاندنی خەلافەتی ئیسلامی،کە سەرەنجام ئامانجە گلاوەکەشیان هاتەدی ،وە چەندان گرۆهو دەستەی تری بیدعەچی و گومرابوو و مولحید هەن،سوپاس بۆ خوا چەندین برا لە شوێنەکەوتوانی ئەهلی سوننە و جەماعە ،خۆیان بۆ مولحید و درژمنانی دین تەرخان کردوەو ،وەلامی شوبهە و بەڵگە بێ بنەماکانیان داونەتەوە، بەردەوامیش لە ئامادەباشیدان بۆ جیهادی قەلەم،جا ئەوەی زیاتر هەستی پێ دەکرێت لە کوردستاندا بیدعەی وەهابییەکانە هەروەك ئاماژەمان پێکرد بە درۆو بوختان ناویان لە خۆناوە (سەلەفی)بەلام رێبازی ئەوانە لەگەڵ رێبازی سەلەف کوجا مەرحەبا،جا ئەم بیدعەچی و گومرابوانەی لای خۆمان سنوری ئەدەب و تەنانەت شەرعیشیان بەزاندوە،تکادەکەین کە هیچ کەس بە سەلەفی ناوزەندیان نەکات بەڵکو بە وەهابی یاخود هەر بە (مەدخەلی)نیسبەت بۆ مامۆستا گومرابوو و دووروەکەی ئەم زەمانەیان،بۆیە پێویستیەکی شەرعییە کە کۆمەڵێکیش خۆیان بۆ ئەمانە تەرخان بکەن،وەلام و رەدییان بدەنەوە ،هەم گومراییەکانیان بۆ خەڵکی موسڵمانی کوردستان رونبکەنەوە.

**پرسیار و وەڵامێك:**

رەنگە کەسانێکی دڵسۆز و شوێنکەوتەی رێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پرسیار بکات و بلێ :بۆ ئێوە هاتون لەسەر ئەلبانی نوسیوتانە ؟!بۆ نەهاتون لەسەر مامۆستا گومرابوەکەی مەدخەلییەکانی لای خۆمان بنوسن لە کاتێکدا تەکفیری موسڵمانانی کوردستانی کردوە و زیناکردنی لە صەلاوات و مەولود کردن بەچاکتر داناوە،هێرشی نارەوا دەکاتە سەر زانایانی راستەقینەی ئەهلی سوننە و بانگخوازەکانی،ئیمامی بوصیری تەکفیرکردوە،موسڵمانانی شوبهاندە بە گاور و جولەکە، چونکە ئاهەنگ بەیادی مەولود دەگێرن،دەمدرێژی دەکاتە سەر مەزاهیب و پیاوچاکان،ئەهلی تصوفی تەکفیرکردوە،قوتابییە نەزانەکانی لە پلەو پایەی پێغەمبەر(صلی الله علیە والە وسلم)و زانایانیان کەمکردۆتەوە،دەیان فەتوای دژ بەرێبازی ئەهلی سوننەی داوە،بونەتە ئەلقە لە گوێی دەسەلات و یارمەتیدەرێکی چاکی دەستگا هەواڵگیرییەکانن و وەدەیان ریسوایتر؟؟!

**لەوەلامدا دەڵێین:**

جا لەوەلامی پرسیارکەری دلسۆزدا دەڵێین :سەرچاوەی سەرەکی رێچکە گومراییەکەیان بریتیە لە:گوتارو فەتواکانی ابن تیمیە،محمد ابن عبدالوهاب ،ناصر الالبانی ،ئەمانە سێ کۆڵەکەی سەرەکین

،لەراستیدا ئەوەی یەکەمییان کە (ابن تیمیە)فەتوای شاز و گوتار و گوفتاری نابەجێ و دەمدرێژی زۆری بەرامبەر صەحابە و زانایان هەیە ،هەروەها بە ناصبی و موجەسیمە ناسراوە ، خاوەن فیکرەی زۆر ترسناك بوە ،لەگەڵ ئەوەشدا کە (ابن تیمیە) خاوەن زانست بوە چاوپۆشی لە هەڵە و پەڵەکانی ناکرێت موطلەقەن نابێت لەسەر مەنهەجی ئەو برۆین و بیکەینە سەر مەزهەب هەروەك وەهابییەکان کردوییانە ،جا ان شاء الله لە داهاتودا بە شێوەیەکی زانستیانە هەڵە و پەڵەکانی ئەم زانایەش دەخەینەروو ،هەرچی ئەوەی دووەمیشە (محمد بن عبدالوهاب)جگە لە بەکرێ گیراوێکی کوفر و نۆکەری ئینگلیز شتێکی تر نەبوو ،هەتا سەردەمی ئەو موسڵمانان لەناویەکدا تەبا بون ، کە ئەم قۆچی شەیتانە سەریهەڵدا، بیروباوەری ابن تیمیەی زیندوکردەوە بە زیادکردنی کۆمەڵە گومراییەکیتر ،هەروەها دەستیکرد بە کوشتن و برینی موسڵمانان،جا لەسەر ئەم زەندیق و گومرابوە شت زۆر نوسراوە ،زیاتر لە سەد پەرتوك لە باس و خواس و وەڵامی ئەم پیاوە دانراوە،بەزوبانی کوردیش پەرتوکێکی تایبەتیمان بە ناوی (ئاژاوەی وەهابییەکان) نوسیوە، ، سەبارەت بە سێیەمییان کە ئەلبانییە تاکو ئێستا بە زوبانی کوردی لە پەرتوکێکی سەربەخۆ باسینەکراوە ،بۆیە دەبینین سەرباری وەهابییەکان خەڵکانێکی تر پێی هەڵخەڵەتاون و بەگوتارە بریسکەدارەکانی ئەم پیاوە فریویان

خواردوە بەتایبەت هەندێ لە مامۆستاکان ،کە هەرچەند وەهابیش نین بەلاّم بەداخەوە شوێن گوتاری ئەم گومرابوە کەوتون، بەلاّم بەدڵنیاییەوە ئەمانە چاك لەم ئەلبانییە نەگەیشتون و ئاگەداری ژیان و زانستی نین،هەروەها ئەوەی ئێمەی هاندا کە سەرەتاکەمان بە باسکردنی ریسواییەکانی ئەلبانی دەستپێبکەین ئەوەیە کە هەموو فیرقـــــه و گرۆهـــــــەکان ی نێـــــو وەهابییـــــــەکان وەك(مەدخەلییەکان،جامییەکان،عەرعوریيەکان،..هتد)ئەلبانی بە پێشەوای خۆیان دەزانن و بە ئیمامی خۆیان گێراوە هەروەها کەسانێکی تریش بەتایبەت لە نێو ئیسلامییەکان ئەلبانی بە ئیمام و موحەدیپ دائەنێن، بۆیە بەهەموو شێوەیەك ئەلبانی لە شوێنی خۆیدابوو کە لەم پرۆژەیە یەکەم کەس بێت کە لەسەری بنوسرێت.

کەواتە :

سەرەتا پێویستە ئیمە ورد و درشتی بیروباوەر و گوتارەکانی سەرانی ئەم رێچکەیە لە تەرازووی قورئان و سوننەت بدەین ئینجا بێینە سەر تازە پێگەیشتوەکان ،چونکە ئەوانە هەمویان هەر یەك قەوان لێئەدەنەوە و سەرچاوەی بۆچونەکانییان دیارە ، کە ئیمە تەواوی گومرایی سەرانییانمان بۆ موسڵمانانی کورد زوبان ئاشکرا کرد ،

ئـــەوکات ناســـین و لـــە تـــەرازوو دانـــی ئـــەم تـــازە پێگەیـــشتوو و تێنەگەیشتوانەی لای خۆمان زۆر ئاسان دەبێ.

## گوتەیەك بۆ وتاربێژان

سوپاس بۆ خوا کۆمەڵێکی چـاك لـە وتاربێـژانی بـەرێزی کوردسـتان لەسـەر عەقیـدەی دروسـتن و گـومرایی وەهابییـەکانیان لـەلا ئاشکرایە،هەر لەم سۆنگەیەوەیە کە چەندان مامۆستاو وتاربێژی بەرێز لـە شـوێنە جیاوازەکـانی ئـەم کوردسـتانە لـە وتارەکانیـان وەڵامـی وەهابییەکانیان داوەتەوە و گومرایی و ریـسوایی وەهابییـەکانیان بـۆ مـەردووم باسـکردوە ،بـەڵام ئـەوەی بـەلای ئێمـەدا گرینگـە کـە بانگەوازی بۆ بکەین ئەوەیە :

وەهابییەکان بەهـەر جـۆرو شـێوەیەك بێـت ئەیانـەوێت مینبـەرەکانی کوردستان داگیربکەن و لەورێیەشەوە کۆمەڵانی خەڵکی کوردسـتان گومرابکـەن،بۆ ئـەم مەبەسـتەش لەهـەر کـام لـە شـارە دیارەکـانی کوردستان دەستیان بەسەر چەند مزگـەوت و مینبـەر داگرتوە،بـەڵێ دەستیان بەسەرداگرتوە چونکە ئەوانە بەچاوی ئەوە سەیری مزگەوت ناکەن کەماڵی خوایە و گشت کەسـێ لێـی ئـازادە ،بـەڵکو ئەوانـە رێچکە گومراییەکەی خۆیان بەسـەر هاموشـۆکەرانی ئـەم مزگەوتـە دەسەپێنن و قورئانخوێندن و زکـرو سـەڵاوات یـان هـەر عیبـادەت و

کردارێکیتر لەگەڵ مەشرەبی ئەواندا نەگونجێت قەدەغەی دەکەن، گەر موسڵمانێکی خۆشەویستی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ئاهەنگێکی بەبۆنەی لەدایکبوونی حەزرەت(صلی الله علیه واله وسلم)ئەنجام بدات ،دژایەتی ئەکەن و بەبیدعەچی ناوی دەبەن ودەڵێن تاوانەکەی لە زینا خراپترە!!!!!!!!!!!!!!

کەچی موحید و بێ براواکان هێرش بکەنە سەردین و کوفر بەخوا و ئیسلام بکەن هیچ کێشەیەکیان نییە و دژایەتییان ناکەن!!!

جا چیە با سوڵتە یاسا و ڕێسای دژ بە ئاین و شەریعەت دەربکات،جا چیە با بێ ئەخلاقی و بەدرەوشتی و گە ندەڵی لە لایەن دەسەلاتەوە بلاوبکرێتە،دەڵێن :باوکم ئەمانە (وەلی ئەمری ئیمانداران)وئەمیری ئیمانداران!!!ئا لەم جۆری قسە و گوتارە ماستاوچییایەتیانە دەڵێن .

کەوابوو:

پێویستە لەسەر وتاربێژانی دڵسۆزی ڕێبازی ئەهلی سوونە و جەماعەت ،ئەو وتاربێژانەی دەیانهەوێت بەرگری لە ڕێبازی مامۆستا گەورەکانی کوردستان و دیرۆکی کوردستان بکەن و وەفایان هەبێت بۆ ئەو ئوستازانەی کە ئیجازەیان پێداون ئەوە با بەهەر جۆرێک کە لەگەڵ کات و شوێنەکەی دەگونجێت بەشدار بێت لە رونکردنەوەی گومرایی وەهابییەکان بۆ خەڵکی ،بەوە فریونەخۆن کە بڵێن ئەمە ئاشوبە یاخود نابێت لەسەرمینبەرئەم شتانە باسبکریت،نەخێر بەڵکو

بەپێچەوانەوەیە بەڵکو باشترین شوێن مینبەرە بۆ باسکردنییان چونکە کە تۆ حەقیقەتی وەهابییەکانت بۆ ئامادەبوانی وتارەکەت رونکردەوە، ئەوە هیچ وەهابییەك ناتوانێت بەیانی بێت هەڵیانخەڵەتێنێت،گەر تۆ ئەمرۆ بۆ گەنجە تازە پێگەیشتوەکانت رونکردەوە حەقیقەتی رێبازی ئەهلی سوونە و جەماعە چییە و زانایانی ئەم رێبازە بۆچونییان چۆنە لەمەر (عەقیدە) و( تەوەسول )و (مەولود) و (مەزاهیب)..هتد ئەوکاتە بەیانی وەهابییەکان ناتوانن ئەم گەنجانە هەڵخەڵەتێن بە بانگەشە ی(قورئان و سوونەت)فریویان بدەن ،کە دروشمێکی راستە بەلاّم مەبەستیان پێی باطلە.(کلمة حق ارید بها باطل)

تێبینی/١_ ئەو دەقەعەرەبییانەی نوسیومانە پوختەی بیرو بۆچون و فەتواکانی البانی یە نەك درێژەی فەتواکانی.

٢_وشەی (گومرا )مەبەست پێی گومراییانە لە رێگای راست نەك کافری ،ئێمە پەنا دەگرین بەخوا لە (تکفیر).

# ئەلبانی کێ یە ؟؟

**قال الامام ابن سيرين(إن هذا العلم دين فانظروا عمن تأخذون دينكم)اخرجة مسلم في صحيحة.**

**واتە (ئەم زانستە ئاینە کەوابوو بوانن بزانن لە کێ دینتان وەردەگرن و فێری دەبن).**

**ئەلبانی یەکێکە لە سەرانی وەهابییەت،هەربۆیە لەگشت بوارەکان بەتایبەت زانستی فەرمودەناسی دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو،بە سەر( مەزهەب) و ( محدث)یان داناوە ، تا ئەو ئەندازەیەی توشی تێپەراندێکی سەیر هاتون لە وەسف و ستایشی هەروەك دەرحەقی دەڵێن(اعلم شخص علي وجهه الارض بالسنة)یاخود(محدث العصر)یاخود( ناصر السنة)وە(امام الدعوة)وە دەیان ناوزەندیتر.**

**گەر بگەڕێینەوە بۆ بەرایی ژیانی زانستی ئەلبانی ئەوکات حەقیقەتی (البانی) ینت بۆ روونده‌بێتەوە،ئەلبانی خۆی لە وڵاتی (ئەلبانیا)لەدایکبوە ،بەڵام باوکی کە زانایەکی حەنەفی مەزهەب و خواناس بوە هیجرەتی کردوە بۆ وڵاتی شام و لە شاری دیمەشق نیشتەجێبوە ،جا ئەلبانی دەخرێتە بەرخوێندن بەڵام تەنها تا پۆلی چواری سەرەتای دەخوێنێت،بۆیە باوکی فێری قورئان خوێندن و**

تجوید وصرف و شتێکی سەرەتایی لە فیقهی حەنەفی دەکـات، دواتـر باوکی مامۆستایەك دەسپێرێت تاوەکو وانە بە محمدی کوری بلێتـەوە، کە ئەویش (سعید البرهانی)بوو،ئەلبانی لـەلای ئـەم مامۆسـتایە تـەنها پەرتوکی((مراقي الفلاح بإمداد الفتاح)خوێند، وەچەند وانەیـەکی لــە رەوانبێژی(بلاغە)دا بۆ دانا،، تا ئێرە کۆتا پلـەی خوێندنی ئەلبانی بـوو لـەبەر دەستی مامۆستا،لـەپاش ئەمەدا روویکردە ئیشکردن و دەستیکرد بــە کاتژمێرچاککردن،ســەبارەت بــە خوێندنــەوەش ئــەوا پەرتوکــە چیرۆکی و غورامییەکانی وەك(عنترە وعبلـە)و رۆمانەکانی وەك(أرسين لــوبين)یــان چــیرۆکە مێژوییــەکانی وەك(قــصە الظــاهر بيــبرس) دەخوێندەوە. (١)

دواتر پەیوەندیکرد بـە کتێبخانـەی(الظاهریـة)لـە دیمەشـق ، تـوانی ژورێك بۆخۆی فەراهەم بکات بۆ خوێندنەوە،ئەوەبوو دەسـتیکرد بـە خوێندنەوە و موگالـەعە،تا هەنگاو بەهـەنگاو لــە خوێندنــەوە، خـۆی وادانا کە موحەدیپی سەردەمەو توانای صەحیحکردن و زەعیفکردنـی هەیە و ئەهلی ئەم عیلـمەیە!!!

لـە کاتێکدا ئەلبانی ئیسنادی موتەصیلی نییە ، بەڵکو پـچراوە مەگـەر ئیسنادی بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبانەی کە تـەنها خـۆی بـەبێ مامۆسـتا موطالـەعەی کردون .

(١)ئەمەش بەدانپێداهێنانی ئەلبانی خۆی ،بروانە(علماء ومفكرون)لا٢٨١دانراوی(محمد المجذوب)

خۆی وادانابوو کە موحەدیسە، لەکاتێکدا یەك حەدیسی بە ئیسنادی موتەسیل تاکو پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وصحبه وسلم)لە بەرنەبووە،خۆشی دانی بەوەداناوە کە موحەدیسی حفظ نەبوە بەڵکو (محدث كتاب)بوە،بەڵێ خوێنەری سەنگین ئەم ئەلبانیە مامۆستاو ئوستادێکی نەبوە کە دەستی بگرێت و فێری زانستی بکات ،هەر خۆی خۆی فێرە زانست کردوە، لە کاتێکدا ئەم علمە بەتایبەت علمی شەرعی و بابەتی عەقیدە پێویستی بەمامۆستا هەیە، چونکە وارێك دەکەوێت کە تۆ پەرتوکێکی عەقیدەیت زۆر لەلا چاکدەبێت ودەیخوێنیتەوەو پەسەندی دەکەیت لەکاتێکدا دەیان موخالەفە و گومرایی تیایە، گەر مامۆستات هەبێت ئەمەت پێرادەگەیەنێت بەلاّم گەر مامۆستات نەبوو ئەوە بەم کتێبە فریو دەخۆی و گومرادەبیت و خەڵکیش گومرادەکەیت هەروەك ئەلبانی وای بەسەرداهات!!!

خوێنەرانی سەنگین ئەم عیلمە کە دینە، بەتەنها بە خوێندنەوە و موطالەعەی بێ مامۆستا بەدەست نایەتن،ئیمامی (الحافظ ابوبكر الخطيب البغدادي)دەفەرموێت(لا يؤخذ العلم الا من افواه العلماء)واتە زانست وەرناگیرێت جگە لە زاری زانایان نەبێت.

هەروەها ئەم فەرموودەیە پیرۆزە ی کە دەفەرموێت(من یرد الله به خيراًيفقهه في الدين))رواه البخاري في صحيحه،واحمد في مسنده ١/٣٠٦وغيرهم.

واتە هەرکەسێ خوای گەورە بییەوێت چاکەی لەگەڵدا بکات ئەوە لە شەرعی فێردەکات)حەزرەت(صلی الله علیه وسلم)فەرموویە(يفقهه)باشترین بەڵگەیە بۆ ئەمە.

یاخود لە ریوایەتێکیتردا هاتوە (انما العلم بالتعلم،والفقه بالتفقه) رواه الطبراني في (المعجم الكبير) ١٩/٣٩٥ ،وقال الحافظ في الفتح ١/١٣١اسناده حسن)

هەزارەها رەحمەت لە ابوحیانی ئەندەلوسی کە فەرمویەتی:

| | |
|---|---|
| يَظنُ الغُمْرُ ان الكتب تهدي | اخا جهل لإدراك العلومِ |
| وما يدري الجهولُ بان فيها | غوامض حيرت عقل الفهيم |
| إذا رمت العلومَ بغير شيخٍ | ضللتَ عن الصراط المستقيم |
| وتلتَبسُ الامورُ عليكَ حتى | تصير اضل م///ن توما الحكيم |

حاشية الطالب ابن حمدون على شرح بحرق على لامية الافعال لا/٤٤.

# هەندێك لەو زانایانەی كە لەوەڵامی ئەلبانیدا پەرتوكیان نوسیوە

- محدث الديار الشامية الشيخ عبدالله بن محمد الهرري الحبشي(رحمه الله) یەكێك بوو لەو كەسانەی كە هەر لە زووە وەڵامی ئەلبانی داوەتەوە و ریسواییەكانی ئاشكراكردوە ،جا چەند پەرتوكێكی لەمەر نوسیوە ،وەك:

التعقب الحثيث على من طعن فيما صح من الحديث.

- نصرة التعقب الحثيث على من طعن فيما صح من الحديث.

- محدث الديار الهندية الشيخ حبيب الرحمن الأعظمي(رحمه الله)،كە لەوەڵامیدا پەرتوكێكی نایابی نوسیوە بەناوی(ألألباني شذوذه وأخطاؤه)لە چوار بەرگدا.

- محـدث شمـالي افريقيـا الـشيخ عبـدالله الغمـاري الحـسني المغربي(رحمه الله)،ئەم فرەزانایە لەوەلاّمیدا چەند پەرتوکێکی نوسیوە ،لەوانیش:
  - (جزء فيه الرد على ألألباني وبيان تدليسه وخيانته)
  - (إرغام المبتدع الغبي بجواز التوسل بالنبي في الرد على ألألباني الوبي)
  - القول المقنع في الرد على الألباني المبتدع.

- المحدث الشيخ عبدالعزيز الغماري(رحمة الله) ،ئەم زانا بەرێزە برای شیخ عبدالله ی غوماریيە،لە وەلاّمی ئەلبانیدا پەرتوکی: (بيان نكث الناكث المتعدي بتضعيف الحارث)نوسیوە.
- الشيخ محمود سعيد ممدوح،ئەم زانا بەرێزە لە ژیاندا ماوە و لە ولاّتی میصرە ،چەند پەرتوکێکی لەوەلاّمی ئەلبانیدا نوسیوە ،لەوانیش:
  - (وصول التهاني بإثبات سنية السبحة،والرد على الألباني)
  - (تنبيه المسلم الى تعدي الألباني على صحيح مسلم)

- الشيخ اسماعيل بن محمد الأنصاري،لێکۆڵەر لە(دار الإفتاء)ی رياض چەند پەرتوکێکی لەوەلاّمی ئەلبانی نوسیوة لةوانیش:

(تصحيح حديث صلاة التراويح عشرين ركعة،والرد على الالباني في تضعيفه)

(إباحة التحلي بالذهب المحلق للنساء ،والرد على الألباني في تحريمه)

(تعقيبات على(سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة للألباني )

- الشيخ المحدث عبد الفتاح ابو غدة.
(كلمات في كشف اباطيل وافتراءات )
- الشيخ محمد بن احمد الخزرجي،وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئاینی ئیمارات،لە رۆژی پێنجشەمە بەرواری ٣ یولیوی ١٩٨٦ ی رۆژنامەی(الاتحاد)وتارێکی لە وەلامی ئەلبانی بە ناوی(الالباني تطرفاته)نوسیوە.

- الاستاذ بدرالدين حسن دياب الدمشقي،لەوەلامیدا پەرتوکی(أنوار المصابيح على ظلمات الألباني في صلاة التراويح)نوسیوە.
- الشيخ سيد حسن السقاف:لەژیاندا ماوەو لە ئوردن نیشتەجێیە، رۆلێکی کاریگەری بینیوە لە ئاشکراکردنی ریسواییەکانی ئەلبانی ،بەتایبەت بەکتێبە بەنرخەکەی(تناقضات الألباني الواضحات)کە تاکو ئێستا لە

سێ بەرگدا کۆی کردۆتەوە ،جگە لەمەش دەیان ناملکەی تریشی لەوەڵامیدا نوسیوە.

جگە لەمانەش زۆر زانای تر وەڵامیانداوەتە بە شێوەی وتاری تۆمارکراوی یاخود مونازەرەیان لەگەڵ کردووە،بەتایبەت شێخی پایەداری ئەم سەردەمە جەنابی دکتۆر محمد سعید رمضان البوطي(حفظە اللە)هەروەها ئیمامی پایەبەرزی ئەم سەردەمە جەنابی شێخ علی جمعە(حفظە اللە)موفتی میسر،عەللامە شێخ عبدالفتاح ابوغدە (رحمە اللە ) وەچەندان زانای تر.

# چەند نمونەیەك لە گوتار و بۆچون و فەتواکانی ئەلبانی بەرامبەر خوای (تبارك وتعالى)

## نماذج من اراء وكلمات وفتاوى الالباني في (الله)تبارك وتعالى

١. ئەلبانی دەڵێ :دامەزرێنەری بانگەوازی سەلەفییەکان خودایەمؤسس الدعوة السلفية هو الله [1] ! (نقول سبحانك هذا بهتان العظيم ) چۆن خودای گەورە دامەزرێنەر و سەرچاوەی بانگەوازی کۆمەڵێکە کە گومرابون لە رێگای راست،چۆن خودای گەروە رازییە بەوەی کە سەلەفی ناوەکان دەڵێن خودا لاشەیە و لە ئاسماندایە کە بە بۆچونی گەورەزانایانی ئیسلام ئەمە

(١) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٨ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .

کوفرە،چۆن خودا بە بانگەوازی سەلەفییەکان رازییە کە بناغەکەیان بریتییە لە (تێکدانی یەکریزی موسڵمانان)ئەی خودا نەیفەرمووە(واعتصموا بحبل لله جميعا)وە یەکێکی تر لە کۆڵەکەی بانگەوازی بەناو سەلەفییەکان بەکەم گرتن و دابەزاندنی پلە و پایەی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)ئال و بەیت و پیاوچاکانە،تاکو ئێستا هیچ فیرقەیەك جورئەتی ئەم جۆرە قسەیەی نەبوە،لێرەدا تەنها ئەوندە دەڵێن(تعالى الله عما يقولون)

٢. خوای گەورە دوو چاوی هەن(پەنا بەخوا)_ **الله عزوجل له عينان** [٢] ! ئەمەش هەردەچێتە خانەی (تجسيم).

٣. خوای گەورە قاچی هەیە( **لله تبارك وتعالى ساق** [٣] !دیسان ئەمەش دەچێتە خانەی تجسيم .

٤. خوای گەروە دەستی راستەقینەی هەیە(واتە دەستی وەك مرۆف نەك دەستی توانا(قودرەت) **لله تبارك وتعالى يداً**

---

(٢) الفتاوى الكويتية للألباني ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص ٤٣ ، ط الأولى، دار الضياء ، مصر .

(٣) سلسلة الأحاديث الصحيحة ، الألباني ، حديث ( ٥٨٣ ) ، ج٢ ص ١٢٨، ط مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .

**حقيقية** [٤] ئەمەش دەچێتە خانەی تە جسيم و لێك چواندنی خودا بە مەخلوقەكان،لە پاشكۆكەدا حوكمی لاشە پاڵدانە لای خودا ڕوونده‌كەینەوە ان شاء الله.

٥. پێكەنين لە سيفاتەكانی خوايە( **الضحك من صفات الله سبحانه وتعالى** [٥] .

٦. سەرسامبون لە سيفەتەكانی خودايە **التعجب من صفات الله عزوجل** [١] .

٧. باوەربون بەوەی كەخودا لە ئاسمانە(**الإيمان بأن الله سبحانه وتعالى موجود في السماء** [٢] .

**قال سيدنا علي بن ابي طالب(كرم الله وجهه):**

---

*(٤) كتاب الشيخ الألباني ومنهجه في تقرير مسائل الاعتقاد ، محمد بن سرور شعبان ، ص ٢١٦ ، ط الأولى ، دار الكيان ، الرياض .*

*(٥) سلسلة الأحاديث الصحيحة ، حديث ( ٢٨١٠ ) ، المجلد السادس ج١ ، ص ٧٣٨ ، ط الأولى ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

*(١) الشيخ الألباني ومنهجه في تقرير مسائل الاعتقاد ، محمد سرور شعبان ، ص ٢٤٣ ، ط الأولى ، دار الكيان ، الرياض .*

*(٢) الحاوي من فتاوي الشيخ الألباني ، أبو همام المصري ، ج١ ص ٤٣ ، ط العلمية بنها ، مصر .*

**((كانَ الله ولامكانَ وهوَ الان ما عليه كان))رواه ابونصور البغدادي.**

واتە:خوا هەبوو بەر لەوەی مەکان هەبێ،ئێستاش هەر بەهەمان شێوەیە ،کە لەپێشدا بەبێ شوێن هەبوو.

نقول:لوكان الله ساكن السماء كما يزعم الالباني لَكان الله يزاحم الملائكمة وهذا محال،فقد ثبت حديث انه((ما في السموات موضع أربع اصابع))وفي لفظ(شبر) ((إلا وفيه ملك قائم أو راكع أو ساجد))

# حوكمی تەجسیم و موجەسیمە لە شەریعەتدا

## لەلای شافعییەکان:

بەشێکیان دەڵێن کوفرە بە موطلەقی،بەشێکی تریان دەفەرمون تەجسیم کوفر نییە بە موطلە قی،وە بەشی سێیەمییان دەڵێن:تەجسیمی روون و صەریح ،کە بگوترێت خودا لاشەیە وەك لاشەی ئێمە ،ئەوە کوفرە،بەلاّم تەجسیمی غەیرە صەریح کوفر نییە.

## لەلای مالیکییەکان :

مالیکییەکان دوو بۆ چونییان هەیە،ئەوەی بڵێ خوا لاشەیە وەك لاشەی ئێمە(جسم كالأجسام)ئەوە بیدعەیەکی کوفرە،بەلاّم گەر

گوتی خوا لاشەیە بەلاّم نەك وەك لاشەی ئێمە ئەوە بیدعەیەکی فوسقە .بەلاّم هەندێکیتریشیان دەڵێن ئەوەش کوفرە.

## له لای حەنەفییەکان:

ئەمانەش بۆ چونییان وەك بۆ چونی مالیکییەکانە.

## لەلای حەنبەلییەکان:

حەنبەلییەکان دەڵێن:

زانـــا و موجتەهیـــدە موجەســـیمەکان کافرن،بـــەلاّم عـــەوام و شوێنکەوتوانییان کافرنین،هەندێکیتر لـە حەنبەلییـەکان بـەبێ تفـصیل موجەسیمە کافردەکەن،هەندێکیشیان خۆیان موجەسیمەن ،وەك(ابـن تیمیە).

بگەرێوە سەر پەرتوکی

**(التجسيم والمجسمة،وحقيقة عقيدة السلف في الصفات الإلهية)دانراوی(عبدالفتاح بن صالح قديش اليافعي).چاپی یەکەم(مؤسسة الرسالة)١٤٣١ه_٢٠١٠م،لاپەرە٣٨٣.**

**کەوابوو:**

**زۆربەی زانایان دەفەرمون کە موجەسیمە کافرە ، بەڵام ئێمە بە پێی بۆچۆنی هەندێ لەزاناکان دەڵێین ئەلبانی بیدعەچییەکی فاسقە.**

## گوتارەکانی دەرحەق بە نێردراوان و پەیامبەران

### سەلامی خوایان لەسەر بێت

### ( من كلماته في الأنبياء والرسل عليهم السلام )

۱. پارێزراوی پێغەمبەرەکان پارێزراویەکی رەها نییە_ **عصمة الأنبياء ليست عصمة مطلقة** [٣] .

۲. پێغەمبەران و نێردراوانی خودا گوناهی بچوك و تاوانییان لێ روودەدات_**الأنبياء والرسل يرتكبون صغائر الذنوب والمعاصي** [٤] . ئەم دوو گوتارەشی پێچەوانەی بیروباوەری

( ٣) *فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٨ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

(٤) *الفتاوى الكويتية للألباني ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص ٢٩ و ٣١، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

ئەهلی سوننەت و جەماعەیە،چونکە پێغەمبەران بەرەهایی پارێزراون لە گشت تاوان و کەم و کورتییەك،وە ئەم قسانەی ئەلبانی زۆر ترسناکن بۆ سەر ئیمان،رەحمەتی خودا لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە و جەماعەت بێت کەفەرمویانە:

**(یجب للأنبیاءِ الصدقُ ویستحیلُ علیهم الکَذبُ،وتَجِبُ لهمُ الفطانةُ ویستحیلُ علیهمُ البلادَةُ والغباوةُ،وتجبُ لهم الأمَانةُ،فالأنبیاءُ سالِمونَ من الکفر والکبائر وصغائرِ الخِسَّةِ وهذه هي العصمةُ الواجبةُ لهم ، ویستحیل علیهم الخیانة،ویجب لهم الصیانة فیستحل علیهم الرَّذالة والسفاهةُ والجُبْنُ،وکلُ ما ینفر عن قبول الدعوة منهم،وکذلکیستحلُعلیهم کلُ مرض مُنَفِّر،فمن نسبَ إلیهمُ الکذبَ أو الخیانةَ أو الرَّذالة أو السفاهةَ أو الجُبنَ أو نحوَ ذلك فقد کفر)**

**بروانە(الصراط المستقيم)**
**الشيخ عبدالله الهررى لاپەرە (١١٠)**

# گوتارەکانی دەرحەق گەورەی مرۆڤایەتی حەرزەتی (محمد )صلی الله علیه وسلم

***( من كلماته في خاتم الأنبياء سيدنا محمد صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم )***

١. پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کات وابوە اجتهادی دەکرد و زۆربەی جاران موافقی راستی بوو،بەڵام جاریش وابوە موافق نەبوە و لەسەر هەڵە بوە،بۆیە وەحی بۆ دابەزیوە تاکو راستی بکاتەوە._ رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم كان يجتهد أحياناً وفي الغالب يوفق للصواب

وأحياناً لا يوفق ويكون على خطأ وينزل عليه الوحي ليصوبه [١] .

٢. دەکرێ و رەوایە کە حەرزەت (صلى الله عليه وسلـم)ئەو ئایاتانە ی بیربچێتەوە کە بەخەڵکی راگەیاندوە، يجوز أن ينسى رسول الله صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم الآيات التي بلغها للناس [٢] .

بزانە برای بەرێزی سەنگینم:

ئەشعەرییەکان کە یەکسانن بەئەهلی سوننەت ،ئیجتهاد پاڵنادەنە لای حەزرەت(صلى الله عليه وسلـم)بە پشت بەستن بە دەقی قورئان کە دەفەرموێت(وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحي يوحى)،باشە گەر حەزرەت (صلى الله عليه وعلى الـه وسلـم)ئیجتهادی بکردبا ئەوکات وەحی ئیشی چی بوو؟؟!!

ئائەوەتە لەدەیان بابەت و حاڵەت حەزرەت (صلى الله عليه الـه وسلـم)وەستاوە و قسەی لێ نەکردوە تاوەکو خودا وەحی بۆ

---

*(١) الحـاوي من فتـاوي الشيخ الألبـاني ، أبـو همـام المـصري ، ج٢ ص ٣٦ ، ط العلمية ببنها ، مصر .*

*(٢) الفتـاوى الكويتية للألباني ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص ٣٠ و٣١ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

دەنارد،جا برای بەرێزم بزانە گرۆهە بیدعەچییەکانی تری وەك(شیعە و موعتەزیلەکان)لەگەڵ هەمان بۆچونی ئەهلی سوونەن.

سەبارەت بە لەبیر چونەوەش ، ئایەتی (سنقرئك فلا تنسى) دەکەینە وەڵام بۆ ئەلبانی.

٣_کاتێك گوفتارێکی حەزرەت لەگەڵ کردەوەیەکی حەزرەت تێکگیر دەبن،ئەوا گوفتارەکە بەپێش دەخرێ_ عندما يتعارض قول رسول الله مع فعله ، نقدم قوله على فعله [٣] .

خوێنەری بەرێز ئەمەش بەم شێوە رەهایە نییە،بەڵکو زانایان فەرمویانە دەبێت سەیری کات و حاڵەتی هەرکام لە قەول و فعلەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بکە ین،چونکە جاروایە پێویستە قسە پێشبخرێت وەجار وایە دەبێت فعل پێشبکەوێت وەحاڵەتی ئەوهاش هەیە کە قەول و فعل جەمع بکرێن،ئەگینا ئەوەتە حەزرەت حەدیسی صحیح نەهی لە خواردنەوە کردوە بە پێوە کەچی خۆشی بەفعلی بەپێوە خواردویەتیەوە،نەهیکردنەکانیش زۆر توندن .

٤_ فەتوادان بە جەوازی روودانی زینا لە خێزانەکانی حەزرەت القول بجواز الزنا على نساء النبي صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم [٥] .

---

*(٣) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص٣٩ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

یەکێکە لە قەبیحترین گوتارەکانی ئەو موئەرریفە،ئەم قسەیەی ئەلبانی دەزانی لە خزمەت کێ دایە؟!بەڵی لەخزمەت کوفری رۆژئاوا و شیعە غولاتەکان دایە،هەر لەسەر ئەم گوتارەشی بوو،کە شیخ محمد نەسب ریفاعی وازی لێ هێناو لێی دابرا، کە لە پێشدا دۆست و قوتابی بوو،لە رەدیشی پەرتوکێکی بەناوی(نوال المنى في إثبات عصمة امهات وأزواج الأنبياء من الزنا)نووسی ، گەر وەهابییەکان بەراست دڵسۆزی دایکمان عائیشەن ،بۆ نایەن پەرتوك لە وەڵامی ئەلبانی بنوسن و بە بەرنامەی تەلەفیزیۆنی باس لە ریسوای موحەدیسەکەیان بکەن؟!هەموو عاقڵێکی دیندار دەزانێت کە هێرشی ئێستای وەهابییەکان،تەنها بۆ مەرامی سیاسی و خزمەتی دەسەڵاتی ئالی خائینی حەرەمەینە،نەك دڵسۆزی بۆ مەزهەبی سوننە،هەربۆیە رێگاکەیان لە شوێنکەوتە دڵسۆزەکانی رێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەش ئالۆزکردوە،فلا حول ولا قوه الا بالله.

٥_ داواکردن بە روخاندنی گومبەتی سەوزی سەر گۆری شەریفی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)وە دەرهێنانی گۆری حەزرەت لە مزگەوتەکە.المطالبة بهدم القبة النبوية وإخراج قبر المصطفى صلى الله

(٥) *سلسلة الأحاديث الصحيحة ، حديث رقم ( ٢٥٠٧ ) ، المجلد السادس ج١ ، ص ٢٦ وما بعدها ، ط الأولى ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

علیـه وآلـه مـن مـسجده [١] .ئەمـەش بـۆ خزمـەتکردن و هێنانـەدی ئامانجەکانی دوژمنانی پێغەمبەرە(صلی الله علیە والـه وسـلم)چـونکە دەمێکە بەرپرسێکی (وەزارەتی دەرەوە)ی(فەرەنسا) گوتویەتی(وما قـبر محمد إلا عمود کهربائي یبعث الجنون في رؤوس المسلمین)واتـە:گـۆرە محمد(صلی الله علیـه والـه وسـلم)کۆڵەگەیـەکی کارەباییە،شـێتاتی زیندوو دەکاتەوە لـە سەری موسڵمانانـدا.

هەر ئەم کافرە گوتویەتی: (اعتقد ان من الواجب :تدمیر الکعبة ووضع قبرمحمد وجثتةفي متحف اللوفر)واتە:باوەڕم وایە:پێویستە(کعبە)ی ماڵـی خـوا بـروخێنن و گـۆری (محمـد) و لاشـەکەی لـە مۆزەخانـەی (لۆڤەر)دابنێین دمروا الإسلام_لا٤٤

هەر لـە سەرەتای دامەزراندنی بزوتنەوەی وەهابیـەکان(کـە بەدەسـتی بەریتانیا دامەزران بۆ لـە نـاوبردنی خەلافـەتی عوسمـانی)یـەکێك لـە پایەکانی بیروباوەریان سوك تەماشاکردنی پێغەمبەر و (صلی الله علیـه والـه سلم)و ئال و بەیت و زانایـان بوو،ئـەویش بەپلانـە گلاوەکـانی کوفر، چونکە ئەزانن ئەو پەیوەندیە رۆحییەی لە نێوان ئیمانـداران و مەرقەدی موبـارەکی حـەزرەت و زانایـان هەیـە هـەردەم هانـدەری

---

(١) تحـذیر الـساجد ، الألبـاني ، ص ٩٨ ومـا بعـدها ، ط الثالثـة ، المکتـب الإسلامي ، بیروت .

موسڵمانان بوە بۆ بەخۆداچونەوەیان و بەردەوامبون لەسەر رێبازی پێرۆزی حەزرەت و زانایانی راستەقینەی ئەم ئومەتە و بەرگریکردن لە ئیسلام،هەرچەند ئەکەین کە عوزرێك بۆ ئەو ئاواتەیان بهێنینەوە بەلاّم هەرگیز بەهیچ عوزرێك قەناعەتمان نایەت،سوێند بەخوا زۆر سەیرە !!نازانین ئەو دژایەتیکردنەی رسول الله لەبەرچی و لە پێناو چییە؟باشەبۆ چاویان بەم گومبەتە سەوزە نورانییەی رسول الله هەڵ نایەت؟خۆجگە لە ئەلبانی لە (محمد ابن عبدالوهاب)تا ئەو ئەوانەی ئەمڕۆ بەم ئاواتەوەبوون،بۆنمونە ( ابن عثیمین)ی موجەسیمە ی وەهابی لە تۆمارێکی دەنگی بەراشکاوی ئاوات بەروخاندنی گومبەتی سەر گۆری شەریفی حەرزرەت دەخوازێت،لەوەش سەیرت و ترسناکتر زانکۆی امام سعودی(وەهابی) سعودیا، شەهادەی دکتۆرای بە_مقبل بن الوادعي_(یەکێك بوو لەسەرانی وەهابیەکان و تەکفیر)بەخشی کە لە دکتۆراکەی داوای روخاندی گومبەتی شەریفی حەزرەت دەکات،باشە زانکۆی سعودیە چۆن دکتۆرا بەکەسێك ئەدات کە دژایەتی رسول الله(صلى الله علیه وسلم)بکات!!!،بەلاّم ئەلێرەدا ئەوەندە بە خۆشەویستانی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم)دەڵێین:خەمتان نەبێت لایزال زۆربەی سەرکردە بەناوسەلەفییەکانی ئێستا بەئاواتی روخاندنی گومبەتی سەوزی شەریفن، بەلاّم خەیاڵییان خاوە و دەبێت وەك ئەوانەی بەر لەخۆیان

بەم ئاواتە سەربنێنەوە،چونکە بەدرێژای مێژووی ئیسلام هیچ تاقم و دەسەلأتدرائِك نەوێرا ئەم ناماقوڵیەبکات گەر ئەوانەش دەیکەن ئەوا خودا پارێزەری رسول الله(بابی انت وامی یا سیدی یارسول الله).

٦_ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)چاکترین دروستکراوی خودا نییە_ رسول الله صلی الله علیه وآله وصحبه وسلم لیس هو أفضل الخلائق عند الله [٢]

سوێند بەخوا سەیرمان بەو گوتارانە نایەت کە لەلایەن ئەو گومرابوە بەیانکراوە،چونکە بەر لەویش (محمد ابن عبدالوهاب)لەو خراپتری گوت و کرد بەرامبەر حەزرەتی رسول الله(صلی الله علیه والە وسلم)خوێنەری سەنگین:کاکی ئەلبانی ئەم قسەیەی لە دژی ئیمامێکی ئەهلی سوننە لەم زەمانە جەنابی دکتۆر محمد سعید رمضان البوطي کردوە،کە شێخی بوطی خوا بی پارێزێت ئیمامی ئەم زەمانەیە و لەهەرە گەورە بانگخوازەکانی عالەمی ئیسلامییە، ئەلبانی و ئەمسالی ئەلبانیش بە قوتابی قوتابی ناشێن،شێخی بوطی خوا جەزای بداتەوە پشتی ئەلبانی و شوێنکەوتوانی شکاند،بە مونازەرەکەی لەگەڵ ئەلبانی و دواجاریش بە پەرتوکەکانی (السلفیة مرحلة زمنیة

(٢) *التوسل أنواعه وأحكامه ، الألباني ، تنسيق محمد عيد العباسي ، ص١٤٩ ، ط الأولى الشرعية ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

مباركة لا مذهب الاسلامي)هەروەها(اللامذهبية اخطر بدعة تهدد الشريعة الاسلامي).

جا سەبارەت بە وەلامدانەوەی ئەلبانی هیچ نالێین، تەنها راگواستنی فەتوایەكی(ابن عثيمين)نەبێ كە ئەویش بەیەكێك لەسەرانی وەهابیەت ئەژماردەكرێت و سەلەفی ناوەكان بەئیمامێكی خۆیان داناوە ،رەدی قسەی ئەلبانی ئەداتەوە و دەڵێت پێغەمبەر(صلى الله على وعلى الە وسلم)باشترین(مەخلوقە)،ابن‌عثيمن‌لە(مجموعالفتاوى)بەرگی(٣)لاپەرە (٢١٩)دەڵێ (ومحمد افضل البشر،بل افضل الخلق على الإطلاق).

وە لەچەندان وانە و پەرتوكی تر ابن عثيمين ئەم قسەیە دووبارە دەكاتەوە،ئەم تێكگیرییە(تناقضات)ی سەرانی وەهابییەكان پێشكەشە بە بەناوسەلەفیەكانی لای خۆمان.

٧_ دایك و باوكی حەزرەت لە دۆزەخدان والِديّ النبي من أهل النار [٣] .

پرسیار لە قازی(أبوبكر ابن العربی المالكی)كرا:دەربارەی پیاوێك كە گوتبووی(باوكی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)لە دۆزەخدایە؟لەوەلامدا فەرمووی:ئەم پیاوە نەفرەت

(٣) صحيح السيرة النبوية ، الألباني ، ص ٢٣ وما بعدها ، ط الأولى ، المكتبة الإسلامية ، الأردن .

لێکراوه(ملعونه)چونکه خوای گەوره دەفەرموێت(ان الذين يؤذون الله ورسوله لعنهم الله في الدنيا والاخرة..)الاحزاب الاية٥٧

واته:بەراستی ئەوانەی خواو پێغەمبەری خوا ئازار دەدەن خودا لەعنەتی لێکردون،لە دونیاو قیامەتدا،ئینجا فەرمووی هیچ ئازارێك لەوه گەورەتر نییه کە دەربارەی باوکی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم)بگوترێ لە دۆزەخدایه.

برای بەرێزم ئازاردان دژایەتی هەیه لەگەڵ خۆشەویستی ،کە بانگەشەی خۆشەویستی حەزرەت(صلی الله علیه وسلم)بکەیت و دواجاریش ئازاری بدەیت چیت بۆدەمێنێتەوه؟؟!

بەڵێ خوێنەرانی سەنگین وا بەچاوی خۆت ئەم بێ ئەدەب و گومرابوه بەناو سەلەفییانەی لای خۆمان دەبینیت، کە چۆن دژایەتی حەزرەت (صلی الله علیه واله وسلم)دەکەن،لە بری ئەوەی خەڵکی فێره خۆشەویستی پێغەمبەر بکەن(صلی الله علیه واله)کەچی بەنێو گەنج و لاوه تازەپێگەیشتوەکان وا بلأودەکەنەوه کە دایك و باوکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)کافرن ، بۆیه دەبین ئەو گەنجانەش چەند بێ ئەدەبانه بێ رێزی بەرامبەر حەزرەت (صلی الله علیه واله وسلم)دەکەن.

ئەوەی زۆر جێگای داخە ،دەبینین هەندێ لەمەندیل بەسەرەکان کە خۆیشیان بە شوێنکەوتەی ڕێبازی راستەقینەی ئەهلی سوننە دانـاوە، کە چی بە گوتارە رەونەقدارەکانی ئەوان هەڵخەڵەتاوەن.

جا خوێنەری بەرێز بەڵگە گەلێ گەلێ زۆرن بۆ وەلاّمدانەوی ئەم بابەتە ،بەلاّم ئێمە ناتوانیین لێرەدا بۆتـانی باسـبکەین،بۆیە تکایـە بگەرێنـەوە سەر پەرتوکی زانایانی ئەهلی سـوننە لـەم بارەیەوە،بۆنمونـە بگـەرێوە سەر پەرتوکی(نخبـة الأفكـار في تنجيـة والـدي المختـار)کـە دانـراوی مامۆستای رەحمەتیمان سەید محمد پیرداودییە(رحمه الله).

٨_ داواکردن بەوازهێنان لە ستایشی حەزرەت المطالبة بعدم مدح النبي صلى الله عليه وآله وإطرائه [٤] .

واتە واز لەخوێندنەوەی مەدیحە و ستایشی حەزرەت(صلى اللـه عليه والـه)بهێنین،با چیتر (مولای یا صل وسلم)نەخوێندرێت،ئەرێ بەراست ئەحزابە ئیسلامییەکان ،ئێوەش ئاگەداربن ،چیدیکە پارەوپوڵ لە شیرك خەسارەت مەدەن،ئەی نازانن ئیمامی زەمانمان!بلیمەتی سەردەم!شێخی موحەدیس!ناصرالدین!!ئەلبانی ،ئەم مەدیح و سرودانەی کە ئێوە لە ستایشی حەزرەت (صلى الله عليه والـه وسلـم)بەرهەمی دەهێنن و لە

(٤) *التوسل أنواعه وأحكامه ، الألباني ، تنسيق محمد عيـد العباسـي ، ص ٨٠ ، ط الأولى الشرعية، مكتبة المعارف للنشـر والتوزيع ، الرياض .*

شاشەکانتان پیشانی دەدەن،تێپەراندنە لە ستایشی حەزرەت (صلى الله عليه وسلم)و شیرکە!!!!؟؟؟؟؟

٩_ حەرامکردنی تەوەسول بە حەزرەت تحريم التوسل بالنبي صلى الله عليه وآله وسلم لله تعالى [٥] . واتە حەرامە لەخوا بپارێیتەوە بەخاتری پێغەمبەر(صلى الله عليه والە)ئەمەش یەکێکیترە لە بیدعە و گومراییکانی ئەلبانی، کە زیندوکردنەوەی بیدعەیەکی (ابن تيميه) کە یەکەم کەس بوو ئەم بیدعەیەی بلاّوکردوە ،تکایە بگەرێوە سەر ئەو پەرتوکانەی لە بارەی توسل نوسراون .بۆ نمونە کتێبی (قضايا الوسيلة والقبور) دانراوی (الامام محمد زكي ابراهيم)یان هەر پەرتوکێکی زانایانی اهلی سوننە.

١٠_حەرامکردنی صەلاّوات بەئاشکرا لە دوای بانگدا، لا يجوز للمؤذن الجهر بالصلاة والسلام على النبي صلى الله عليه وآله وسلم عقب الأذان [١] . ئەمەش جۆرێکی ترە لە دژایەتیکردنی صەلاّوات،خوێنەری بەرێز وەك گوتمان ئێمە لەم نامیلکەیە زیاتر

---

*(٥) أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، ص ٢٦٦ و٢٦٤ ، ط الرابعة ، المكتب الإسلامي ، بيروت . وكتاب التوسل أنواعه وأحكامه ، للألباني .*

*(١) تمام المنة ، الألباني ، ص ١٥٨ ، ط الخامسة ، دار الراية ، الرياض . وسلسلة الأحاديث الضعيفة . الألباني ، حديث ( ٨٩١ ) ، ج٢ ص ٢٩٤ ، ط الثانية ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

مەبەستمانە گومراییەکانی ئەلبانی ئاشکرابکەین و ناتوانین وەڵامەکان بەم شێوە کورتە بنوسین ،بۆنمونە گەربێت و لەسەر بەڵگەکانی دروستی ئەم جۆری سەڵاواتە بنوسین، خۆی لەخۆیدا پێویستی بە نامیلکەیەکە، بۆیە بگەرێوە سەر ئەو پەرتوکانەی کەلەم بارەیەوە نوسراون،بەتایبەت نامیلکەکەی مامۆستای رەحمەتیمان عەللامە(سید محمد پیرداودی)کە لەم بارەیەوە زۆر جوانی پێکاوە .

١١_ قەدەغەکردنی صەڵاوات لەکاتی سەرسامبون بەشتێك منع الصلاة على النبي صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم عند التعجب من أمر ما [٤] .

١٢_ حەرامکردنی گەشت بۆ مەدینە بەمەبەستی زیارەتی گۆری شەریفی حەرزەت(صلی الله علیه وسلم) تحريم السفر لزيارة سيدنا النبي صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم[٥] . ئەمەش زیندوکردنەوی بیدعەیەکی (ابن تیمیه) خوا لێی ببورێت.

---

*(٤) قاموس البدع مستخرج من كتب الألباني ، إعداد مشهور السلمان وأحمد الشكوكاني ، ص ٧٠١ ، ط الثالثة ، دار الإمام البخاري ، قطر .*

*(٥) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات . جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٢ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر . أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، =*

۱۳_لە فەتواکانی البـانی :دروسـتنیە پاداشـتی کـردەوە چـاکەکان پێـشکەشبکریتٚ بـە حـەزرەت(صـلی الله علیەوسـلم)یـاخود هـەر یەکێکیتر کە مردووە.لا یجوز إهداء ثـواب الأعمـال الـصالحة لـسیدنا النبي صلی الله علیه وآله وسلم ولأي شخص من الأموات [۲] .

۱٤_ لەفەتواکانی:رێگری لە ئاهەنگ گێران بەیادی لەدایکبونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) منع الاحتفال بالمولد النبوي الشریف [۳] .

۱٥_ لەگوتارەکانی : مەولود لە دابونەریتی نصاری یە_ الاحتفال بالمولد النبوي نابع من تقلید النصاری [٤] .واتە ئەم موسڵمانانەی کە ئاهەنگ دەگێرن بەیادی مەولود وەك نەصرانییەکانن،بەقسەی ئەلبانی بیٚ ئیمە مانان هەموو کافرین، چونکە حەزرەت دەفەرموێت(من تشبه بقوم فهو منهم) کەوابوو کە ئێمەش یادی مەولود بەبەرز رادەگرین

---

= ص ۲٦٥ ، ط الرابعة ، المکتب الإسلامي ، بیروت .

(۲) أحکام الجنائز وبدعها ، الألبـاني ، ص ۲٦۰ و۲٦۱ ، ط الرابعـة ، المکتـب الإسلامي ، بیروت .

(۳) فتـاوی الألبـاني في المدینة والإمـارات ، جمـع عمـرو عبـدالمنعم سـلیم ، ص ۱٥٥ ، ط الأولی ، دار الضیاء ، مصر .

(٤) فتـاوی الألبـاني في المدینة والإمـارات ، جمـع عمـرو عبـدالمنعم سـلیم ، ص ۱٥٥ ، ط الأولی ، دار الضیاء ، مصر .

وەك ئەوانیین،جا بەم قسەیەی ئەلبانی (ابن تیمیە)ش دەچێتە ریزی نەصرانییەکان چونکە ئەویش مەولود بە کارێکی چاك دادەنێت(بگەرێوەسەرپەرتوكی(ئاژاوەیوەهابیەکان)لاپەرە_٦٩_٧٠_٧١_گوتارەکەی (ابن تیمیە)ی تیایە بە وێنەوە.)

١٦_یەکێکیتر لە دژایەتیەکانی بەرامبەر حەزرەت(صلی اللە علیە والە وسلم)گوتنی (السلام علی النبی)لە جیاتی(السلام علیك ایها النبی)بروانە(صفە صلاە النبی)لا١٤٣.

ئایا ئەلبانی نەیزانیوە کە سیدنا ابابکر وعمر بن الخطاب و ابن الزبیر و جگە لەوانەش لەپاش وەفاتی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم)لە سەر مینبەر ،خەڵکیان فێری تەشەهود بە بێژەی(السلام علیك أیها النبی ورحمە اللە وبرکاتە)دەکرد، هیچ صەحابەیەك بەرهەڵستی نەکرد.بروانە(شرحمعانیالاثار،ب١/لا٢٦٤)،(سوننەنی ئیمام بیهقی،ب٢/لا١٤٢)،(الموطإ ی ئیمام مالك(کتاب الصلاة:باب التشهد في الصلاة)

جا برای موسڵمان تۆ شوێن حەزرەتی صدیق و فاروق و ئەصحابی کیرام دەکەویت ،یان ئەلبانی جاهیلی سەرلێ شێواو؟؟؟!!

## بۆچونەکانی لەمەر تەقلید و مەزاهیب و گرۆهەکان

## ( رأيه في التقليد والمذاهب والفرق )

- حەرامکردنی پەیوەست بوون بە مەزهەب _ تحريم المذهبية والانتساب لمذهب محدد كالشافعي أو الحنفي [٢] .ئەمەش تەنها بۆ تێکدانی شەریعەتی ئیسلامە،بۆ زانینی گومرایی وریسوایی ئەم گوتەیەی البانی و لەم جۆری بروانە پەرتوکی(اللامذهبية)ی عەلـلامەی پایەدار شیخ محمد سعيد رمضان البوطي.

(٢) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص٤٣ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .

- یەکسانکردنی مەزهەبی حنفي(ئیمام ئەبو حەنیفە) بە ئینجیلی تەحریفکراو_ مساواة الفقه الحنفي بالإنجيل المحرف [1]

یەکسان کردنی ئینجیلی تەحریفکراو بە مەزهەبی حەنەفی!!برای خوێنەر ئەزانی ئەم گوتارە چی دەگەیەنێت؟ئەوە دەگەیەنێت کە شەریعەتی ئیسلام ،قورئان و سوننەت تەحریفکراوە،چونکە ئیمامی ئەبو حەنیفە(رضی الله عنە)مەزهەبەکەی لە قورئان و سونەت بە ئیجتیهادی خۆی هەڵێنجاوە.

جا لێرەدا هیچ ناڵێین ،تەنها ئەوە نەبێت کە زانای پایەبەرز و پارێزەری رێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە لەکوردستان(مامۆستا عبدالله هەرتەلی)_ حفظه الله_کە لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

پاش ئەوەی باس لە ئیمام_(أبو حنیفە)دەکات،لە ژێر ناونیشانی_دژایەتی ئەلبانی لەگەڵ ئیمامی حەنەفی_دەفەرموێت((ئەی لاوی موسڵمان:لەم چەند دێرەی رابردوو بۆت ئاشکرابوو کە ئیمامی (حنفی)کام زانای بەرێزە،گومانم نیە،رێزو حورمەتی ئەم بەرێزە لەناو دڵی گشت موسڵمانێکی لەخواترس جێی ئەبێتەوە،بەڵام ئەوەی جێگەی داخ و سەرسورمانە،ئەوەیە:کە پێشەوایەکی (خوارج)ی ئەم

---

(١) مختصر صحيح مسلم للمنذري ، تحقيق الألباني ، حديث ( ٢٠٦٠ ) ، ص ٥٤٣ ، ط الثالثة الجديدة ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .

سەردەمە_بۆ خزمەتی (کفر)_لەپلەی ئەم ئیمامە بەرێزە کەم ئەکاتەوە و هەوڵ ئەدا: گومان بخاتە ناو دڵی لاوەکانی ئیسلام بۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان،بفەرموو بەچاوی خۆت ببینە (البانی)بەرامبەر ئیمامی(حنفی)چی دەڵێ؟!

ئایا ئیمامی(حەنەفی)وەکو(انجیل)بەمەزهەبی خۆی_کە لەقورئان و حەدیس وەری گرتوە_خزمەتی ئیسلامی کردوە،یان_وەکو(البانی)_بۆ بەرژەوەندی کوفر ڕیزی موسوڵمانانی تێك داوە و موسوڵمانانی خستونەتە گومان لە ئاینی ئیسلام؟!

حەدیسەکەی(خیر امتی قرنی...)ئیمامی حەنەفی دەگرێتەوە،بەڵام:هەی (ئەلبانی)کام حەدیس جەنابت دەگرێتەوە؟مەگەر حەدیسەکەی(شرار امتی اخرها).

ئەی لاوی موسڵمان:جەنابت خۆت بڕیاربدە:ئایا (البانی)شیاوی ئەوەیە:ئێمە شوێنکەوتەی بین و تەنها پەرتەوازە و تێکدانی ڕێزی موسڵمانانی لێ فێربین و واز لە زانایانی(السلف)بهێنین؟

کەسێك ئەم جۆرە تۆمەتانە بداتە پاڵ زانایانی(سلف)چۆن دروستە باوەڕی پێ بکەین کە دەڵێ:ئەم حەدیسە(ضعیف)ە؟گوڵزاری ئیسلام،لا٨_٩بەدەستکارییەوە.

- لە گوتارەکانی البانی :دامەزرێنەری دەعوەی سەلەفییت خودایە ،مؤسس الدعوة السلفية هو الله [٣] .
- ناوزەنکردنی گشت کۆمەڵەو جەماعەتەکانی تری جگە لە سەلەفی بە ئەهلی بیدعە چونکە پاڵنادرێنە لای عیصمەت،بەڵام سەلەفییەکان معصومن. تسمية الجماعات من البدع إلاّ الجماعة السلفية ، لأن الجماعات غير السلفية لا تُنسب إلى العصمة ، أمّا السلفية فهم ينتسبون إلى العصمة [٤] .
- گومراکردن و لەخانە بردنە دەرێی کۆمەڵەی تەبلیغ لە ئەهلی سوننە،خوێنەرانی سەنگین ئەم کۆمەڵەیە گەورەترین خزمەتییان بەئیسلام کردووە لە وڵاتی پاکستان ،گشتیان زانا و بانگخوازی رەبانینە،دەورێکی گرنگیان بینیوە بۆ هۆشیارکردنەوەی موسڵمانان و گەڕاندنەوەیان بۆ لای خودای پەروەدگار،بەڵام چونکە ئەوانە بناغەیەکی سۆفیگەرییانەیان هەیە، تەواو ئەوە

---

*(٣) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٨ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

*(٤) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص٢٧ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

لەفەرهەنگی ئەلبانی گومرانە ،لجماعة التبليغ صوفية عصرية ، لا تقوم على كتاب الله ولا سنة رسوله [٥] .

- بەرهەڵستیکردنی جمهورو دەرچون لێیان وە حوکمی ئەوە بەسەر خۆیدا دەدات کە جمهوری نییە،بروانە(شرح العقيدة الطحاوية)لا٤٨٧

ئەمەش پێچەوانەی فەرمودەی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)کە دەفەرموێت(عليكم بالجماعة ..)رواه الترمذي.

- دروست نیە خانوو بەکرێ بدرێتە صوفییەکان گەر هاتو مەزهەبەکەیان تێدا ئاشکراکرد_ لا يجوز تأجير المساكن للصوفية إذا أعلنوا فيها مذهبهم [١] .بۆ ئەم فەتوایە جگە لە پێکەنین ،هیچ تەعلیقێکی ترمان نییە !!!!!!!!
- تەکفیرکردنی ئەشعەری و ماتوریدییەکان ،لە تۆمارکراوێکی دەنگیدا،بۆ ئەمەش هیچ تەعلیقێکمان نییە ،تەنها ئەوە نەبێت کە داوادەکەین خوێنەری خاوەن عەقڵ و دڵسۆز کە لێکۆڵینەوە

---

*(٥) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص٣١، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

*(١) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٣٦ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

بکات و بزانێت ئایا ئەشعەرییەکان فیرقەی ناجیەن یان نا،وەئایا بە درێژای مێژووی ئیسلام ،کە ئەوکات وەهابییەکان لەناومندالّدانی ئینگلیز بوون کێبون بەرگرییان لە ئیسلام و ڕێبازی ئەهلی سوونە و جەماعە کرد؟وە بزانێت پێشەواکانمان نمونەی(الحافظ ابوبکر البیهقي،ابن عساکر،ابن حجر العسقلاني،الحافظ ابا نعیم الأصفهاني،امام الحرمین،الحافظ الدارقطني،الحافظ الخطیب البغدادي،ابا القاسم القشیري،ابا اسحق الشیرازي،حجة الاسلام الغزالي،الامام احمد الرفاعي،القاضي عیاض،الامام النووي ،فخرالدین الرازي ،العز بن عبدالسلام،الشیخ زکریا الأنصاري،الحاکم النیسابوري،السید محمد مرتضی الزبیدي)سەدان پێشەوای ترو تەنانەت شانازی گەلی کورد صلاحدینی ئەیوبی و نورەدینی زەنگی ئایا لەسەر عەقیدەی ئەشعەری بون یان نا؟؟

- ئەلبانی پەیوەستبون بە مەزهەبەوە بەیەکێ لەنیشانەکانی رۆژی دوایی دادەنێت، (١) ١_ السلسله الصحیحه ( ٧٧٤/٢/٦ – ٢٨٢١/٧٧٦ )
- ئەلبانی لە (سلسله احادیث الصحیحه) بەرگی(٦)لاپەرە٦٧٦ ئەوانەی پەیوەستن بە مەزهەب و ئەشعەری و صۆفییەکان بە (اعداء السنة) ناوزەندییان دەکات .

ئەوەی تۆزقاڵێکیش لە زانستی شەرعی بزانێ ئەزانێ کە (اعداء السنة) کافرن ، کەوابوو لە روانگەی البانی ئەمانەی کە ریزبەندی کردون گشتیان کافرن، کەوایە دەپرسم :گەر(مەزهەبیە کان )و(ئەشعەرییەکان)و(صۆفییەکان) کافر و دوژمنی سوننە بن ،ئەی کێ موسڵمان دەمینی؟؟؟!!!!!

## لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە

**( القرآن الكريم )**

- حەرامکردنی ماچکردنی قورئان ئەمەشی بە بیدعەو گومرایی داناوە_ **تحريم تقبيل المصحف الشريف وجعل تقبيله من البدع والضلالة** [٢] .

---

*(٢) رسالـة كيف يجب علينا أن نفسر القرآن الكريم؟ ، الألباني ، ص ٢٨ ، ط الأولى ، المكتبة الإسلامية ، الأردن .*

- گوتنی(صدق الله العظیم)لە دوای خوێندنەوەی قورئان بیدعەیە(مەبەستی بێ بیدعەی خراپە)قول ( صدق الله العظیم ) بعد قراءة القرآن من البدع [٣] .
- حەلاڵکردنی خوێندنەوی قورئان بۆ ئافرەتی حەیزدار إباحة قراءة القرآن للمرأة الحائض [٤] خوێنەری سەنگین جمهوری عولەمای ئیسلام دەڵێن حەرامە ئافرەتی حەیزدار قورئان بخوێنێت و دەستی لێبدات،تکایە بروانە پەرتوکی(إعلام المبیح الخائض بتحریم القران علی الجنب والحائض)ی دانراوی سەید حەسەن سەقاف.

## لەبارەی مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ

### ( المساجد وصلاة الجماعة )

(٣) فتاوی الألباني في المدینة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سلیم ، ص١٦٣ ، ط الأولی ، دار الضیاء ، مصر .

(٤) فتاوی الألباني في المدینة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سلیم ، ص٢٣٣ ، ط الأولی ، دار الضیاء ، مصر .

- دروستنیه بەرپاکردنی نوێژی بەکۆمەڵ بۆ دووەم جار پاش تەواوبونی جەماعەتی یەکەم .لا تجوز إقامة صلاة جماعة ثانية في المسجد بعد انقضـاء الأولى [1] .
- میحرابی مزگەوتەکان بیدعەن_ وجود المحـراب في المسجد بدعة [4] .
- رێگیریکردنی ئافرەتانی زانا و داعیات لە تەدریس و دەعوە بۆ ئافرەتان لە مزگەوتەکان_ منع الداعيات والعالمات من تدريس النساء وتعليمهن في المساجد [5] .
- حەڵاڵکردنی چونە ژورەوەی ئافرەتی حەیزدار بۆناو مزگەوت و مسجد الحرام و طواف و خوێندنەوەی قورئان_ إباحة دخول المرأة الحائض للمساجد والمسجد الحرام والطواف بالكعبة المشرفة وقراءة كتاب الله [1]

---

*(١) تمام المنة ، الألباني ، ص ١٥٥ ، ط الخامسة ، دار الراية ، الرياض .*

*(٤) سلسلة الأحاديث الضعيفة ، الألبـاني ، حـديث ( ٤٤٨ ) ، ج١ ص ٦٤١ إلى ٦٤٣ ، ط الثانية ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

*(٥) سلسلة الأحاديث الصحيحة ، الألبـاني ، حـديث ( ٢٦٨٠ ) ، ج٦ ص٤٠١ ، ط مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

***(١) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص٢٣٢ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .***

- هەرکەسێ بیست رەکعات نوێژی تەراویح بکات پێچەوانی سوننەتی کردوە. من يصلي التراويح عشرين ركعة فقد خالف السنة [٢]

## لەبارەی دوعا و نزا

## ( الدعاء )

- حەرامکردنی داواکردنی دوعا لە یەکێکی تر پاش تەواوبونی کۆر و وانە،دروستنیە بەبرا موسڵمانەکەت بڵێی دوعام بۆبکە یاخود داوای دوعات لێدەکەم.**تحريم طلب الدعاء من الآخرين بعد الانتهاء من الدرس أو جلسة المذاكرة ، فلا يجوز أن تقول يا فلان ادعُ لي أو نسألك الدعاء** [٣]

.

- حەرامکردنی دوعا لە لایەن وتاربێژی هەینی بۆ موجاهیدەکان و ئەو موسڵمانانەی لەسەنگەری جیهاد دان

*(٢) الحاوي من فتاوى الشيخ الألباني ، ابو همام المصري ، ج١ ص ٣٢٦ ، ط العلمية ببنها ، مصر .*

*(٣) قاموس البدع مستخرج من كتب الألباني ، إعداد مشهور السلمان واحمد الشكوكاني ، ص ٧٠٢ ، ط الثالثة ، دار الإمام البخاري ، قطر .*

_ **تحريم الدعاء للغزاة والمرابطين والمدافعين من قِبَلِ خطيب صلاة الجمعة** [٤] .تەعلیقمان نییە ئەوەندە نەبێ دەڵێین ئەم فەتوایە لەپێناو کێ و بەرژەوەندی کێ یە؟؟!!!

## لەبارەی رامیاری و جیهادەوە

## ( الجهاد والسياسة )

- پێویستە لەسەر خەڵکی فەلەستین واز لەولاَتەکەیان بهێنن و بۆ ئیسرائیلی چۆڵ بکەن _ **على أهل فلسطين أن يغادروا بلدهم ويتركونها للمحتل الصهيوني** [١] .

*(٤) الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة، الألباني ، ص ٧٢ ، ط الثانية ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

- **الانتفاضة الفلسطينية على المحتل الصهيوني عمل محرم وغير جائز** [٢] .

واتە :ڕاپەڕینی فەلەستینیەکان بەرامبەر ئیسرائیلی داگیرکەر کارێکی ناشەرعی و جائیز نییە.

زانای پایەرزی ئەهلی سوننەو جەماعەت لەم زەمانە ،جەنابی دکتۆر **محمد سعيد رمضان بوطي** (خوا بیپارێزێت)لە بارەی ئەم فەتوایانەی ئەلبانی دەفەرموێت:

(چەند مانگێکە ناصرالدین ئەلبانی هەموانی سەرسامکرد،بەفەتوایەکی سەیر،کە زۆر دوورە لە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامەوە،کە ئەوپەری ئاڵۆزی و دژایەتی هەیەیە لەگەڵ پەیرەوو بنەماکانی ئیسلامدا،چونکە بەئاشکرا بڕیاریدا بەبەرچاوی هەموانەوە کە پێویستە لەسەر موسڵمانانی ناو فەلەستینی داگیرکراو هەموویان ئەو زەوییە جێ بهێڵن بۆ جولەکەکان،کەدوای ئەوەی داگیریان کردووە،تازە بووەتەوە وولاتی کوفر،بەپێی لێکدانەوەی ئەو ،ئیتر نابێت موسڵمانانی تیا بمێنێت،ئەگەر هەواڵەکە بەشێوەی کۆمەڵ نەیانگێراباوە

(١) فتاوى الشيخ ألـلبانى ، عكاشه عبدالمنان ، ص ١٨ ، گ الپانيه، دار الجيل، بيروت .

(٢) سلسله أشرگه الهدى والنور ، للألبانى .

و بەهۆی تۆمارگەوە بەدەنگی خۆی نەمبیستبایە باوەرم نەدەکرد!چونکە سادەترین فێرخواز دەزانێت بەپێی شەریعەتی ئیسلام کە وولاتی ئیسلامی تا رۆژی دوایی هەربە ولاتی ئیسلامی و لەحوکمی ئەوەدا دەمێنێتەوە ،چەندێ کافرو دوژمن فەسادیان تیاکردبێت ،پێویستە لەسەر موسلمانەکانیش کە هەولی پاك کردنەوەی بدەن لە دەستێوەردان و دوژمنکاری.

ئیمامی ئەبوحەنیفە کە فەرموویەتی:ئەگونجێ وولاتی ئیسلام بگەرێتەوە بەوولاتی کوفر،مەرجی ئەوەی بۆداناوە کە شەعائری ئیسلامی تیا لابچێت،تەنها حوکمی کوفری تیا جێ بەجێبکرێت،وەنابێ موسلمانی تیادامابێ ،هەروەها ئەهلی ذیمە کە لەژێر سایە و ئەمانی ئیسلام دابووبن،هەروەها ئەبێت ئەو وولاتە هاوسنوری وولاتی جەنگ بێت،ئاشکرایشە کە هیچ یەکێ لەم سێ مەرجە لەزەوییە داگیرکراوەکەی فەلەستیندا نییە،بانگ و شەعائری ئیسلامی تیا بەرز دەکرێتەوە ،موسلمانەکان لەناو ژیانی ئاسودەیی ئیسلامی یەکەمدا دەژین،وەهیچ وولاتێکی کوفر یان جەنگ نییە کە هاوسنوری فەلەستین بێت.

بەلام ئەلبانی:کە خۆی بە (موحەددیث)دەزانێت لە رای ئیجماعی شەرعی لای داوە،کە پێی ئاگەدارنییە،بۆیە بەرامبەر هەموان بێ شەرمانە گوتی :فەلەستین بەهۆی ئیسرائیلەوە ،بووەتە وولاتی کوفر و

حەرب،بۆیە پێویستە لەسەر هەموو خەڵکەکەی بەجێی بهێڵن و کۆچی لێ بکەن!

ئەوەی جێگای سەرسورمانە ،ئەم شێخە گومان لێکراوە ،بەدرێژایی ساڵانی رابردوو ،لە بڵاوکردنەوەی ئەم فەتوایە بێ دەنگ بوو،ئەو هەموو ژیانە تاڵەی ئەوان هیچی بیر نەهێنایەوە،تا ئەوکاتەی راپەرینی بروادارى لەناوجەرگەی فەلەستینەوە دەستی پێکرد،بزووتنەوەی حەماس پەیدابوو،ترس و بیمی خستە ناو دڵی جولەکە داگیرکەرەکانەوە،ئینجا ئەم فەتوایەی بیر کەوتەوە و لەم کاتەدا بڵاوی کردەوە ،کەئیتر کاتی ئەوە هاتوە بەراشکاوی فەتواکەی بڵاوبکاتەوە،وەبانگی سەرکردەکانی ڕاپەرین بکات کە هەنگاوی قۆناغی پێشکەوتنیان زۆر ناوە،کەواز لە ووڵاتی خۆیان بهێنن و کۆچ بکەن،ئیتر کاتی ئەوە هاتوە کە ئیتر جولەکەکان بێزار نەکەن و خەسارەیان لێنەدەن ،ئایا ئەم شێخە گومانلێکراوە پێمان ناڵێت بۆچی تائێستا ئەم فەتوایەی شاردۆتەوە و باسینەکردوە ،کە گوناهە موسڵمانەکان لەزەوی داگیرکراودا بمێننەوە!!

سوپاس بۆخوا فەتواکەی هەرگیز لەئارادا نەبوو هەر خۆیشی نەبوو،کاتێ کە سوری و جەزائیری و میصری و لیبییەکان لە ووڵاتەکانی خۆیاندا جیهادییان دەکرد،تا لەداگیرکەران پاکیان بکەنەوە و ڕزگارییان بێت...بە لای ئەلبانییەوە ئەوکاتەش کە

وولاّتەکان داگیر کرابوون ،هەمووی بونەتە وولاّتی کوفر،کەچی کە ئەمرۆ سەیرییان دەکەین ،هەموو وولاّتی ئیسلامین،بەلاّم بەپێی فەتوای ئەلبانی بوایە ،مافێکی ڕەوەای داگیرکەران بوو ،لەوانەیە هەر ئەمەیشی مەبەستت بوبێت)_جیهاد لە ئیسلامدا_لا/٢٧٥

ڕاپەرین و شۆرشەکانی گەلانی ئازادیخوازی وەك (تونس) و(میصر) باشترین بەلّگەی بەرچاون ، خۆمان وا هەنوکە روداوەکانی ئەم ولاّتانەمان لەبەرچاون ، ئەبینین بەناو سەلەفییەکان چۆن ماستاوچییایەتی بۆ طاغوتەکان دەکەن و دژایەتی ئیرادەی گەلە چەوساوەکانییان دەکەن .

ئەوی زۆر جێگەی پێکەنین و مایەیەی سەرسامییە ، مەدخەلییەکانی ئێرە تینی ماستاوچییاتییان لەم کاتە زیاتر بۆ هاتوە و ئەتوانی بەچاوی خۆت سەیری مالپەرە کوردیەکانییان بکەیت کە چۆن رووی راستەقینەی خۆیان دەردەخە ن.

خوێنەری سەنگین ئەم فەتوایەی (البانی) پێچەوانەی سوننەتە و لەتەڕەف شەیتانەوەیە،هەروەك (دکتۆ عەلی الفقیر)ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئوردن لەوکات لەبارەی ئەم فەتوایە گوتی:( **إن هذه الفتوى صادرة عن شيطان"**)

(دکتۆ صلاح الخالدی)لەبارەی گوتویەتی:( **إن الشيخ الألباني في فتواه خالف السنّة**)

بەڵێ خوێنەرانی بەرێز هەرکەسێ تۆزقاڵێك ئیمان و عەقڵی هەبێت دەزانێت ئەم فەتوایە بۆ بەرژەوەندی کێ یە و لە دژایەتی کێیە،ئەوەش (ولاء والبراء)ی سەرکردەکەتان بەناو سەلەفییەکان، کە شەو و رۆژ ولاء و براء لە سەر زارتانە،بێگومان ئەم فەتوایە بۆ خزمەتی جولەکە و ئیسرائیل زیاتر بۆ کەسی ترنییە،خوێنەرانی سەنگین بناغەی دروستبونی وەهابییەکان بەدەستی بەریتانیا بوو بۆ روخاندنی خەلافەتی ئیسلامی،کە سەرەنجام هەدەفەکەیان سەری گرت و خەلافەتی ئیسلامی بەیارمەتی وەهابییەکان روخێندرا، لەو لاشەوە هاتن پاشایەتییان بۆ ئال سعودی وەهابی سعودیا فەراهەمکرد،دەسەڵاتدرا بە ئالی سعود سوڵتەی ئاینیش درا بە ئالی شێخ(محمد عبدالوهاب)،بەدرێژای مێژووی ئەم دوو ئالە، واتە(ئالی سعود)و(ئالی شێخ)جگە لە نۆکەری بۆ کوفر زیاتر،هیچ ئاورێکیان لە ئیسلام و موسڵمانە چەوساوەکان نەداوەتەوە، ،گەر سعودیا مەبەستی بێت زرۆ بەئاسانی دەتوانێت فەلەستین رزگار بکات،بەڵام خادمی حەرام چۆن شتی لەم جۆرە دەکات،خوای گەورە ریسوایان بکات و روو رەشی دونیاو قیامەتییان بکات .

- یەکێکی تر لە فەتوا سەیرەکانی حەرامکردنی دوعا و نزایە بۆ موجاهیدان و ئەوانەی لەسەنگەری جیهاددان لە لایەن

وتاربێژی هەینی تحريم الدعاء للغزاة والمرابطين والمدافعين من قِبَلِ خطيب صلاة الجمعة [٣] ،موسڵمانان و ئیمانداران ،ئەی ئەوانەی خاوەن عەقڵ و دڵسۆزن بۆ ئەم ئیسلامە، خۆتان بریار لەم بارەیەوە بدەن،ئایا ئەلبانی نوێکەرەوەی دینە یاخود تێکدەری؟؟!ئایا موجەسیمە و مورجیئەیە یاخود ئیمامی ئەهلی سوننەیە؟!ئایە(ناصر الدین)ە یاخود(هادم الدین)ە!؟لێرەدا لە جێگای خۆیەتی کە روو بکەینە بزوتنەوە ئیسلامییەکان، کە پێیان بڵێین حوکمی ئێمە بەرامبەر ئێوە وەك ئەو کەسانە نییە کە تەکفیرتان دەکەن وە وەك ئەوکەسانەش نین کە بەمەعصومتان دائەنێن ،بەڵکو ئێمە دەڵێین چاکەکانتان چاکن خراپەکانیشتان خراپن و خوا چاکیان بکات،جا بۆ ئەو چاکانەی کە هەست و سۆز و غیرەتی ئیسلامیان هەیە با بزانن ئەلبانی هەڵوێستی چۆن بووە،زۆر لامان سەیرە کە زۆرێك (نەك هەمووی)لە کەسە دیارەکانی نێو ئیسلامییەکان بەشان و باڵی ئەلبانیدا هەڵدەرێن ،لەکاتێکدا ئەلبانی ئێوەی پێ گومرایە و دەتانخاتە نێو حەفتاو دوو گرۆهەکە،خۆ فەتواکانی ئەلبانی لەم بارەیەوە زۆر روون و

---

(٣) الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة ، الألباني ، ص ٧٢ ، ط الثانية ، المكتب الإسلامي ، بيروت .

ئاشکران بەلاَم بۆیە راگوێزی ئەم کتێبەمان نەکرد تاوەکو نەبینە پارێزە(محامی)هیچ لایەك، بەلَکو تەنها پارێزەی رێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بین،هەروەها لای هەموتان دەمدرێژی و بەگومراکردنی شەهید حەسەن بەننا و هاوەلاَنی لەلایەن ئەلبانی ئاشکرایە،ئەسلَەن ئێوە لەفەرهەنگی بەناو سەلەفییەکان گومراو بیدعەچی و لە حەفتاودوو گرۆهەکەن ،بەتایبەت لەلای مەدخەلییەکان ،جا لێرە زۆر بەدلَنییایەوە دەلَێین خۆتان چاك دەزانن کە ئەلبانی کێ یە و چۆن بووە ،وە هەروەها وەك ئێمەش وەهابییەکان دەناسن، بەلاَم لەواندیە تاکە شتێك کە ببوێتە مەیل چون بۆ عەقیدەیان بەرژەوەندی سیاسی بێت ،جا ئەوکاتیش ئێمە وەك ئیمام سەعیدی نەورەسی دەلَێین(اعوذ بالله من الشیطان والسیاسة)

## لەبارەی دایك وباوکەوە

## ( الأب والأم )

- دروست نیە دەستی دایك و باوك ماچبکرێت، بگرە ئەوانە بیدعەن_ لا يجوز تقبيل يد الأب أو الأم بل هو من البدع [1] .

*(١) قاموس البدع مستخرج من كتب الألباني ، إعداد مشهور السلمان وأحمد الشكوكاني ، ص ٧١٨ ، ط الثالثة ، دار الإمام البخاري ، قطر .*

- سەردانیکردنی گۆڕی دایك و باوك لەهەموو هەینیەك(هەفتانە)دروستنیە و بیدعەیە_ زیارة قبر والدين في كل يوم جمعة عمل غير جائز ومن البدع[2].

## لەبارەی ( أحكام للمرأة )

- حەرامکردنی زێری محلق بۆ ئافرەتان_ **تحريم الذهب المحلق على النساء من خواتم وأساور وما شابه** [3].

---

*(٢) أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، ص ٢٥٨ ، ط الرابعة ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

*(٣) آداب الزفاف ، الألباني ، المقدمة وص ٢٢٢ وما بعدها ، ط الأولى ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض ، الحاوي من فتاوي الشيخ الألباني ، أبو همام المصري ، ج٢ ص ١٥٢ و ص ١٦٩ وما بعدها ، ط العلمية بينها ، مصر*

- دروستنیە بۆئەوئافرەتتەی کە ریشی هاتوە بیتاشێت.**لایجوز للمرأة التي نبتت لها لحية أن تحلقها** [٤] .

- **منع الداعيـات والعالمات من تدريس النساء وتعليمهن في المساجد** [٣] .

## لەبارەی مردووەکان

**( الأموات )**

- دروستنیە گواستنەوەی لاشەی مردوو بۆ شوێنی دوور بۆ شاردنەوەی لەلای گۆری ئال و بەیت و پیاوچاکان .**لا یجوز**

*(٤) فتوى مسجلة بصوته ، وأكدها أبو إسحاق الحويني في محاضـرة لـه مـصورة بالفيديو في موقعه على شبكة الانترنت ، وراجع أيـضاً فتـاوى الألبـاني في المدينـة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص ٢٤٨ في الحاشـية ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

*(٣) سلـسلة الأحاديـث الـصحيحة ، الألبـاني ، حـديث ( ٢٦٨٠ ) ، ج٦ ص٤٠١ ، ط مكتبة المعـارف للنـشر والتوزيـع ، الريـاض . والفتـاوى الكويتيـة للألباني ، جمع عمرو عبدالمنعم سـليم ، ص ٧٤ و٧٥، ط الأولى ، دار الـضياء ، مصر .*

**نقل الميت إلى أماكن بعيدة لدفنه عند قبور أهل البيت والصالحين [٢] .**

- **عدم جواز قراءة سورة يس على المحتضر [٣]**
- **خوێندنی فاتیحە بۆ مردوو و هەروەها داواکردنی خوێندنەوەی فاتیحە بۆ روحی کەسێ بیدعەیە و پاداشتەکەی ناگات بە مردووان.قراءة الفاتحة للموتى وطلب قراءة الفاتحة على روح فلان بدعة والقراءة لا يصل ثوابها للأموات [١] .**

## *هەندێك فەتواو گوتاری جیاواز*

**( متفرقات ومنوعات )**

*(٢) أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، ص ٢٤٨ ، ط الرابعة ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

*(٣) أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، ص ٢٤٣ ، ط الرابعة ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

*(١) أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، ص ٢٥٦ و٢٥٧ و٢٥٩ ، ط الرابعة ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

- ئاوهێنانەوە بەدەست رۆژو ناشکێنێت بەتاڵی ناکاتەوە_ الاستمناء لا يفطر الصائم ولا يبطل الصوم (٤) .

ئەمەش ئاستی نەزانی ئەم پیاوەمان لە بواری (فیقهی) بۆ بە دیار دەخات.

- قەدەغەکردنی ئاهەنگ گێران بەیادی ئیسراومیعراج_ منع الاحتفال بليلة الإسراء (٥) .
- حەرامکرنی بەکارهێنانی تەسبیح بۆزکری خودا_تحريم استخدام المسبحة في تسبيح الله (١) .
- پانتۆڵ حەرامە جا بۆ ئافرەت بێ یان بۆ پیاو_لبس البنطال ( البنطلون ) حرام سواء للرجال أو النساء (٢) .

---

*(٤) تمام المنة ، الألباني ، ص ٤١٨ ، ط الخامسة ، دار الراية ، الرياض .*

*(٥) قاموس البدع مستخرج من كتب الألباني ، إعداد مشهور السلمان وأحمد الشكوكاني ، ص ٧١٨ ، ط الثالثة ، دار الإمام البخاري ، قطر .*

*(١) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٦١ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

*(٢) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٥٠ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر ، الحاوي من فتاوي الشيخ الألباني ، أبوهمام المصري ، ج٢ ص١٧ ، ط العلمية بنها ، مصر ، وشريط بصوته ضمن سلسلة الهدى والنور .*

- دانانی رۆژی هەینی بەرۆژی پشو بیدعەیە_اتخاذ یوم الجمعة یوم عطلة بدعة [٤] .

بەرەزامەندی (حەزرەتی عمر )رضی الله عنه ئەم شتە دانراوە ، بروانە کتێبی (بغیە المسترشدین) لاپەرە (٨٣).

- دروستنیە لەکاتی نانخواردن بڵێت(بسم الله الرحمن الرحیم)تەنها دەبێ بڵێیت (بسم الله) لا یجوز للإنسان أن یقول عند الأکل ( بسم الله الرحمن الرحیم ) بل یقول ( بسم الله ) فقط ولا یجوز أن یزید ( الرحمن الرحیم ) [٣] .
- ئاوخواردنەوە بە پێوە(راوەستاو) دروستنیە _ لا یجوز للإنسان أن یشرب وهو قائم [٤] .

---

*(٤) الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة، الألباني ، ص ٦٥ ، ط الثانية ، المكتب الإسلامي ، بيروت .*

*(٣) سلسلة الأحاديث الصحيحة ، الألباني ، حديث ( ٣٤٦ ) ، ج١ ص ٦٨١ ، ط مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .*

*(٤) سلسلة الأحاديث الصحيحة ، الألباني ، حديث ( ١٧٧ ) ، ج١ ص ٣٤٠ ، ط مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض . الحاوي من فتاوي الشيخ الألباني ، أبو همام المصري ، ج٢ ص ٧٧ ، ط العلمية بنها ، مصر .*

- تراشینی سمێڵ کارێکی مونکەرە_ حلق الشارب أمر منكر [٥] .
بەلاّم لەوەناگەین بۆ بەناو سەلەفییەکان گشتیان سمێڵ دەتراشن.؟؟؟؟؟!!!!!!
- دروستنیە مانگی رەجەب دیاری بکرێ بۆ بەرۆژوبون_لا يجوز تخصيص شهر رجب بالصيام [٣] .
- ئینکاری کردنی ناوزەندکردنی فریشتەی روح کێشان بە(عزرائیل)دەڵێ ئەمە ئیسرائیلیاتە و ئەسڵی نییە.

خوێنەری بەرێز ئەمەش نەزانی ناصر السنه!!مان بۆ بەدیار دەخات ،ئەوەتا (قاضي عياض)لە ئیجماع نەقڵی کردوە کە لەسەر ئەوەن کە ناوی فریشتەی روحکێشان (عزرائیلە)بروانە(کتاب الشفاء)٢/٣٠٣.

کە وابوو ئەم ئیجماعە کافیە :

***(وعليكم بالجماعة فإن الله لا يجمع هذه الأمة على ضلالة)_موافقة الخبر الخبر ١/١١٥***

---

*(٥) فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ص١٤٦ ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .*

*(٣) قاموس البدع مستخرج من كتب الألباني ، إعداد مشهور السلمان وأحمد الشكوكاني ، ص ٧٢١ ، ط الثالثة ، دار الإمام البخاري ، قطر .*

- حەرامکردنی درێکردنی شمەك بۆ خوار گۆزینگ، با نیەت و مەبەستی فیز و تەکەبوریش نەبێت(مختصر الشمائل)لا ١٠١.

بۆ وەلاّمی ئەم بابەتەو تێگەیشت لێی بروانە(ما وقع من الشوب في مسألة تقصير الثوب)ی سەید حسن سەقاف

- حەرامکردنی بەکارهێنانی تەسبیح بۆ یاد و زکری خوا(ضعيف الجامع ١١٠/١/١١٧)

بۆ وەلاّمی ئەم بابەتە و تێگەیشتن لێی بروانە(وصول التهاني بإثبات سنية السبحة والرد على الألباني)دانراوی شێخ محمود سعيد ممدوح.

- حەرامکردنی بەرۆژوبونی رۆژی شەممە بەتەنها،بۆ وەلاّمی ئەم فەتوایە بروانە(وهمُ سئ البخت الذي حرم صيام السبت)ی سەید حسن السقاف.

## ئەلبانی و دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (رضی الله عنها)

خوێنەری سەنگین ،ئەوەی ئەلبانی گوتویەتی دەرحەق حەزرەتی عائیشە هیچ کەمتر نییە بگرە گەر زیاتریش نەبێت لەوەی کە رافیزییەکان دەرحەقی گوتویانە و دەیلێن،لە پێشدا باسمان لەوەکرد کە چۆن فەتوای داوە بە ئەگەری زینا لەحەزرەتی عائیشە(پەنا بەخوا)ئەم جارەیان حەزرەتی عائیشە بە سەرپێچیکاری سوننەت بە ئەنقەست و پابەند نەبوو بەسوننەتەوە تۆمەتبار دەکات ،ئایا دەبێت سزای ئەوکەسانە چی بێت کە دەمدرێژی و زماندرێژی دەکەنە سەر دایکی ئیمانداران!!؟؟ ،رۆژانە لە کەناڵە وەهابییەکان بەبەرچاومانە کە چۆن سەنگەریان گرتوە بەرامبەر شیعەکان ،بەڵام حەق وایە هەروەك چۆن هێرش دەکەنە سەر ئەو گومرابوانەی وەك خۆتان، بەهەمان شێوەش باس لە ریسواییەکانی ئیمامەکەتان بکەن و وەڵامی بێ رێزی و دەمدرێژییەکانی ئەلبانی بدەنەوە.

جا خوێنەری سەنگین رەنگە بپرسیت کوانێ ئەلبانی ئەم قسانەی کردووە؟

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین برای خۆشەویستمان بەلێ ئەلبانی ئەم قسانەی کردوە و بوختانی پێناکەین ،ئەمە دەقی گوتەکەیەتی ،کە لەپەرتوکی(اداب الزفاف)لا/١٦٥دا دەلێ

((فهذه مخالفة صريحة من عائشة رضي الله عنها لحديثها فإذا جاز في حقها ذلك فبالأحرى أن تخالف حديث غيرها لم تروه هي وهي على

كل حال مأجورة، فماذا يقول المشار إليه في هذه المخالفة؟ أيدع الحديث والمذهب لقولها، )

بۆئەوەیش کە پێش ئەوەی وەهابییەکان بڵێن بابەتەکە بەم شێوەیە نییە گوتارەکە قرتێندراوە ،ئەوە وەلامی شێخ إسماعيل بن محمد الأنصاري يە ، لەوەلامی ئەلبانیدا دەڵێ (موقف الألباني هذا لا يرضاه مسلم بل يفرح به عدوه إذ ليس من المعقول أن تتعمد عائشة مخالفة حديث ثبت عندها عن النبي صلى الله عليه وسلم ولا أن تكون مأجورة على ذلك، ثم إذا جوز الألباني على عائشة زوج النبي صلى لله عليه وسلم وأم المؤمنين وأفقه النساء أن تتعمد مخالفة حديث روته هي أو رواه غيرها عن النبي صلى الله عليه وسلم فماذا ينتظر الناس أن يقوله الألباني في حق غيرها ١

---

١_بروانە كتاب إباحة التحلي بالذهب المحلق للنساء والرد على الألباني في تحرمه، تأليف إسماعيل بن محمد الأنصاري صفحة ١٣٧

## ئەلبانی ئیمامی بوخاری بەکافر و گومرابوو دادەنێت

## الألباني يضلل ويكفر الإمام البخاري!!

ئــەلبانی لــە پەرتوکەکەیــدا(فتــاوی الالبــانی)لاپــەرە٥٢٣ باســی تەئویلەکــەی ئیمــامی بوخــاری کــردووە لــە ســورەتی (القــصص)ئایــەتی(کــل شــئ هالــك الا وجهــە)کــە بــە مــولکی لێکداوەتەوە،جا ئــەلبانی دەڵێ( ان هــذا التأویــل لا یقــول بــە مــؤمن مسلم)واتــە:هــیچ موســڵمانێکی ئیمانــدار ئــەم تەئویلــە ناڵێــت)واتــە کەسێك موسڵمان و ئیماندار بێت ئەمە ناڵێت،جــا ئــەلبانی ئینکــاری ئەم تەئویلــەی ئیمامی بوخاری دەکات و دەڵێ لە بخاری تەئویلی لــەم جۆرە نەهاتوە کە خودی لەپەکخستنە.

جا خوێنەرانی سەنگین، ئەلبانی بــەم گوتــارەی یەکــەم کەســێك کــە کافری بکات ئیمامی بوخارییە،چونکمە گشت نوسخەکانی صــحیحی بوخــاری ئــەم تەئویلــەیان تێدایــە و ناتوانــدرێت بــسەلمێندرێت کــە لەنوسخەیەکی بوخاری ئەم تەئویلە نەبێت، هەروەك چــۆن نــاتوانرێ بەری تیشکی رۆژ بەبێژیگ بگیرێت،بۆنمونە بروانە:

صحیح البخاري کتاب التفسیر تفسیر سورة القــصص صــفحة ١٧٨٨ الجزء الرابع مطبعة ابن کثیر الیمامة الطبعة الثالثة .

جا بەرێزان جگە لە ئیمامی بوخاری ئیمامی سفیان الثــوري، وە ابــن تیمیــەی مامۆســتای یەکــەمیان ،ئــەم تەئویلــەیان کردووە،کــەوابوو ؟؟؟؟!!!!!!!!!!!!!!.

# ئەلبانی و شیرك

ئەلبانی لە (فتاوی)دا لاپەرە/٣٥١،٣٥٠ سەبارەت بە ئایەتی
{ إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ (٤٨)} ﴿ سورة النساء﴾دەڵێ (ليست الآية على عمومها و شمولها، فبعض الشرك يغفر)واته :ئایەتەکە شمولی نییە و خوای گەورە لە هەندێك شیرك خۆشدەبێت.

بەلاّم ئایا دەزانی برای خوێنەر ئەمە رەتدانەوی گوفتاری خوایە،چونکە خوای جل جلالە فەرمویەتی(:{ إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ (٤٨)} ﴿ سورة النساء﴾باسی هیچ ئیستثانەیەکی نەکردوە ،حەزرەتیش (صلی الله علیه واله وسلم)دەفەرموێت(:" إن الله ليغفر لعبده ما لم يقع الحجاب" قيل: و ما يقع الحجاب يا رسول الله؟ قال:" أن تموت النفس و هي مشركة") رواه أحمد في مسنده(٥/١٧٤).

کەوابوو ئەلبانی دژی ئەم دوو دەقە گوتاری داوە،کە ئەلبانی لەواتای فەرموودە نەگات، کە بانگەشەی پسپۆڕێتی لێدەکرد چۆن لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەگات کە ئەهلی تەفسیر نییە؟؟!!

هەروەها ئەلبانی دیسان لە بارەی شیرکەوە دژی قورئان قسەدەکات ،قاعیدەیەکی داناوە کە هیچ کەسێك بەر لەو بەعەوام و عالمەوە باسیان نەکردوە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێ:

كل كافر مشرك و كل مشرك كافر فتاوى الألباني (ص/ ٣٥١

کـــــه ئەمـــــەش پێـــــچەوانەی گوفتـــــاری خوایـــــه ،چـــــونکه لـەسورەتی(البینه)ئایەتی شەش دەڵێت(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ (٦)} ﴿ سورة البينة
خوای گەورە کوفری دابەشکردوە بۆ دوو جـۆر کـوفری ئیـشراك و کوفری غـەیرە ئیـشراك،جا خوێنـەری سـەنگین تـۆ بەشـوێن قورئـان دەکەویت یان شوێن ئەلبانی؟؟!!!
تێبینـی/بـەلاَم خوێنـەری سـەنگین بزانـە:خـوای گـەورە لـەوکەسـە خۆشـنابێت ،کـە لـەوکاتـەی دەمرێـت ،بـەردەوام بوبێـت لـەسـەری ،تەوبەی نەکردبێت،گەر بەر لـەمردن تەوبەبکا لـەشیرك قبوڵە.

# گومراکردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)

# له لایەن ئەلبانییەوه

# والعیاذ بالله

لە (**فتاوى الألباني**)لاپەرە٤٣٢ دا دەڵێ:
من دەڵێم ئەوانە ی کە تەوەسول دەکەن بە ئەولیاو پیاوچاکەکان، وە شـــوێنکەوتنی قورئـــان و ســـوننەت یاســـا غ دەکــەن،هیچ کێـــشە و بەربەستێك نابینم کە ناویان بنێم بە گومرابورن لـە حەق(**ضـالون عـن الحـق**)چونکە خوای گەورە ئەمەی بەرامبەر حەزرەت(صلى الله عليه وســلم)بــەکارهێناوە بــەر لـــەوەی وەحـــی بــۆ دابـــەزێت ،وەك دەفەرموێت(**ووجدك ضـالا فهى)سورة الضحى** )
ســوێند بــەخوا ئـەو قـسەیەی ئـەلبانی کـوفرە ،بۆ؟چـونکە ئەوانـەی تەوەسول بە ئەولیا و پیاوچاکان دەکەن بەلای ئەلبانییەوە موشـریکن، کە ئەمە بەڵگە نەویستە ،کـەوابوو لێکـچواندنی گـومرایی پێغەمبــەر (صلى الله عليه وســلم)بـەگومرایی ئەوانـەی کـە تەوەســول دەکــەن یەکسانە بەوەی کە حەزرەتیش موشریکە.
سوێند بەخوا هـیچ پاســاوێك نییــە بـۆ ئـەم قـسەیە،چونکە مەبەســت لەئایەتەکە ئەوەیە کە حەزرەت صلى الله عليهوسلم لـە پـێش وەحـی وردو درشتی ئیمانی نـەزانیوە ،نـەیزانیوە قورئـان چـییە ،نـەك مانـای وابێت کە حەزرەت کافر و موشریك بوبێت ئینجا رێنومایان کرد،جـا تەنها لـەیەك کاتدا یەکسانکردنەکەی ئەلبانی تەواوە کە ئایەتەکــە بــە کوفر و شیرك تەفسیر بکات،جـا کەئەوەشـی کـرد واتـە پێغەمبــەری کافرکرد!!!!

## بێ ئەدەبی و بێ رێزی ئەلبانی بەرامبەر زانایانی ئیسلام

هەركەسێ ئاگەداری نوسین و گوتارەكانی ئەلبانی بێت ،دەزانێت ئەلبانی چەندە بێ رێز و دەمدرێژە بەرامبەر زانا گەورەكانی ئیسلام،ئەوەش سەیر نییە ،چونكە ئەلبانی بێ رێزی بەرامبەر خوای بالأدەست و گەورەی مرۆڤایەتی دەكات ،جا بێ رێزی بەرامبەر زانایان هەر زۆر سادەیە بۆ ئەلبانی!!

بۆ سەلماندنی قسەكەشمان چەند بەڵگەیەكتان بۆ دەهێنینەوە:

١. ئەلبانی بێ شەرم ،ئیمامی پایەدار شێخی سیوطي(رحمه الله)بەبێ شەرم و ژاوەژاو دروستكەر لە پێنوس دەدات،ئەوەش وتەكانیەتی لە (سلسلة احاديث الضعيفة)دەرحەق بە ئیمامی سیوطي:

﴿ وجعجع حولهُ السيوطي في اللآلي دون طائل ﴾ ١٨٩/٤

ئەو جارەش ئیمامی سیوطی (بەبێ شەرم)دادەنێت:

﴿ فيا عجباً للسيوطي كيف لم يخجل من تسويد كتابهِ الجامع الصغير بهذا الحديث ﴾ ٤٧٩/٣

ئەم جارەش ئەم موتەناقیضە ئیمامی سیوطی بە متناقض ناوزەند دەكات

" ثم إن السيوطي تناقض . . ( ٤ / ٣٨٦ ).

٢. بەهەمان شێوە لە سیلسلەکەیدا، ئیمامی ذهبی بە متناقض و کەمتەرخەم لە گەران و لێکولێنەوە تاوانباردەکات،بروانەب٤/لا٤٢٢ .

٣. بەهەمان شێوە هێرش دەکاتە سەر ئیمام حاکمی نەیسابوری،خاوەنی پەرتوکی(المستدرك)و بە موتەناقیض ی وەسف دەکات و پێیوایە کەوتۆتە نێو هەڵەی فاحیشەوە.

" ولذلك فقد أخطأ الحاكم خطأ فاحشا " ! " ( ٣ / ٤٥٨ )

: " قلت : ومن تناقض الحاكم في المستدرك)

في كتابه " التوسل " ص ١٠٦

٤_بەهەمان شێوە ئیمامی ابن الجوزی بە موتەناقیض وەسفدەکات:

" ولذلك فقد أساء ابن الجوزي بإيراده لحديثه في " الموضوعات " ! على أنه قد تناقض ، فقد أورده أيضا في " الواهيات " يعني الاحاديث الواهية غير الموضوعة " في " صحيحته " ( ١ / ١٩٣ )

٥_بەهەمان شێوە دەمدرێژی دەکاتە سەر (ئیمامی سبکی) و بە دەمارگیری وەسفدەکات:

قال عنه في " ضعيفته " ( ٢ / ٢٨٥ ) أثناء تخريج حديث هناك ما نصه : " ثم تعقبه السبكي نحو ما سبق من تعقب الحافظ لابن طاهر ، ولكنه

دافع عنه بوازع من التعصب المذهبي ، لا فائدة كبرى من نقل كلامه وبيان ما فيه من التعصب. . "

٦_دیسان بەهەمان شێوە ئەلبانی ئیمامی موحەدیث الحافظ المناوی(رحمه الله) به دەمارگیر و موتەناقیض ناوزەندەکات:

في ضعيفته ( ٢ / ٣٤٥ ) ما نصه : " بل هو من تعصب المناوي . . "

وقال في " ضعيفته " ( ٤ / ٣٤ ) : " وإن من عجائب المناوي التي لا أعرف لها وجها أنه في كثير من الاحيان يناقض نفسه "

٧_بەهەمان شێوە بیّ رێزی بەرامبەر امير المؤمنين لە فەرمودەدا( الحافظ ابن حەجەری عەسقەلانی) دەکات و بە موتەناقیضی ناوزەندەکات:

وليس يخفى على طالب العلم أن هذا التناقض من مثل هذا الحافظ – يقصد ابن حجر رحمه الله– ما هو إلا لأنه ... ضعيفته٣/٢٦٧

٨_بەهەمان شێوە بیّ رێزی بەرامبەر ئیمام محمد سعيد رمضان البوطي دەکات و بە موتەعەصیب و جاهیلی ناوزەند دەکات.بروانە(الدفاع عن السنه النبويه)کە دانراوی ئەلبانییە،

٩_بەهەمان شێوە دەمدرێژی دەکاتە سەر ئیمام عبدالفتاح ابو غدە(رحمه الله)دوعای خرابی لێدەکات ،هەروەها بەگاڵتەجاریش باسیدەکات:

(أشل الله يدك وقطع لسانك -يدعو على العلامة الشيخ عبد الفتاح أبو غدة-. كشف النقاب ٥٢

وەدەڵێت(إنه غدة كغدة البعير)

١٠_ئیمام عبدالله ی غوماری موحەدیثی مەغریب، بە پیس و مودەلیس وەسفدەکات ،مقدمته لصفة صلاته ٢١

١١_بەهەمان شێوە لەدوای ئەوەی ستایشی شیعیب الارناؤط ی دەکرد ،دواتر لۆمەی دەکات، مقدمته لآداب زفافه ص٢١.

١٢_هەروەها زماندرێژی دەکاتە سەر ئیمامی موفەسیر شێخ علی صابونی و بە مودەلیس و جاهیل و دزو گومرا وەسفدەکات مقدمه آداب زفافه ٤٩

وسلسلة احاديث الصحيحة.

١٣_بەهەمان شێوە زماندرێژی دەکاتە سەر شێخی موفەسیری سەردەم شەیخی شەعراوی و شێخی خەطیبان شێخ عبدالحميد كشك (خوا لێیان خۆشبێت)و دەڵێ ئەوانە خۆیان نازانن نوێژ چۆن بەرپادەکەن جا چۆن دەتوانن خەڵکی فێرە نوێژبکەن،هەروەها شێخی شەعراوی بەجاهل و عەقیدە موئحەریف و شێخی کشك بە قصاص ناوزەند دەکات،دەتوانن سەردانی پێگەی(یوتیوب)بکەن دەیان بێ ڕێزی ئەلبانی ببیستن بەرامبەر ئەم دوو بانگخوازە گەورەی ئیسلام.

١٤_هەروەها لۆمەی شێخ حسن البنا(رحمه الله)دەکات.پێگەی (یوتیوب).

## لاوازکردنی فەرموودەکانی

## صحیحی بوخاری و موسلیم لەلایەن ئەلبانییەوە

ئەمەش بەهەنگاو بوو ،سەرەتا لە تەعلیقاتی لەسەر (شرح العقیدة الطحاویة)ی ابن ابی العز حەنەفی ،لەپاڵ ئەو فەرموودانەی کە لە صەحیحەین هاتبون، نوسی (صحیح)،کەئەمەش لە زانستی فەرمودەناسی شوێنی نابێتەوە و بابای خوێنەر بۆ ئەوە دەچێت کە لە صەحیحەین ئەحادیسی زەعیفیش هەبێت،هەربۆیە زانایان لەوکات زۆر ئامۆژگارییان کرد ،بەلاّم سودی نەبوو،تا دواجار لەوەلاّمیدا پەرتوکییان نووسی ،لەوانیش شێخی عەللامە(عبدالفتاح ابو غدە)بوو.

جا لێرەدا چەند نمونەیکتان بۆ دەهێنینەوە کە ئەلبانی چۆن حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیمی ضعیف کردووە:

**١_حدیث((قال الله تعالى:ثلاثة انا خصمهم یوم القیامة:رجل اعطى بي ثم غدر،ورجل باع حُرا فاكل ثمنه،ورجل استأجر اجیراً فاستوفى منه ولم یعطیه اجره))**

ئەلبانی لە(ضعیف الجامع وزیادته))بەرگی٤/لا١١١،بەژمارە ٤٠٥٤هێناویەتیەوە و دەڵێ:رواه احمد والبخاری عن ابی هریره((ضعیف))!

ئەم حەدیسە بەژمارە(٤١١٤)لە سەحیحی بوخاریدایە.

**٢_حديث(لا تذبحوا إلا بقرة مسنة،إلا تتعسر عليكم فتذبحوا جذعة من الضأن)**

ئەلبانیلە(ضعیفالجامع وزیادته)بەرگی٦/لا٦٤،بەژمارە٦٢٢٢ دەڵێ:رواه الامام احمد ومسلم وأبوداود والنسائي وابن ماجة عن جابر((ضعیف)).

ئەم حەدیسە ،بەژمارە(١٩٦٣)لەسەحیحی موسیلم دایە.

**٣_حديث(إذا قام احدكم من الليل فليفتتح صلاته بركعتين خفيفتين))ئئةلبانى لة(ضعيف الجامع وزيادته)بةرطى ١/لا٢١٣** ،بەژمارەی٧١٨ دەڵێ :رواه الامام احمد ومسلم عن ابي هريرة((ضعيف))!!

ئەم حەدیسە ،بەژمارە(٧٦٨)لە سەحیحی موسلیم دایە.

**٤_حديث ((انتم الغر المحجلون يوم القيامة،من إسباغ الوضوء،فمن استطاع منكم فليطل غرته وتحجيله))**

ئەلبانی لە (ضعيف الجامع وزيادته)بەرگی۲/لا۱٤ ، بەژمارە(١٤٢٥)دەڵێ:رواة مسلم عن ابي هريرة((ضعيف بهذا التمام))!

ئەم حەدیسە بەژمارە(٢٤٦)لە سەحیحی موسلیم داهەیە.

**٥_حديث((إن من اعظم الامانة عند الله يوم القيامة الرجل يفضي الى امراته..))**ئەلبانی لە (ضعيف الجامع وزيادته)بەرگی۲/لا۱۹۲،بەژمارە(١٩٨٦)دەڵێ: رواة احمد ومسلم وابوداود عن ابي سعيد (ضعيف)!!

ئەم حەدیسە ،بەژمارە(١٤٣٧)لە سەحیحی موسلیم داهەیە.

٦_حديث ((من قرا(کە راستییەکەی_حفظ_)العشر الاواخر من سورة الكهف عصم من فتنة الدجال))ئەلبانی لە (ضعيف الجامع وزيادته)بەرگی٥/لا۲۳۳ ، بەژمارە ٥٧٧٢ دەڵێ:رواه احمد ومسلم والنسائي عن ابي الدرداء((ضعيف))!!

ئەم فەرمودەیەش ،بەژمارە(٨٠٩)لە سەحیحی موسلیم داهەیە.

بەڵێ خوێنەری سەنگین،ئەمانە چەند نمونەیەکی کەم بوون ،لە زەعیفکردنی فەرموودەی سەحیحی بوخاری و موسلیم ،لەلایەن موحەدیسی وەهابی و تەلەفییەکان جەنابی (ئەلبانی)!!!!!!!

## ئەلبانی وەڵامی ئەلبانی ئەداتەوە

خوێنەری سەنگین،ئەلبانی لە نێو زانایان و فێرخوازانی ئەهلی سوننە وجەماعە،بە(متناقض)ناسراوە، ئەمەش چەند نمونەیەك لە دژیەك و تێکگیرییەکانی(تناقضات)ی ئەلبانی:

١_حەدیسی محمود بن لبید،کە دەڵێ(أخبر رسول الله(صلی الله علیه وسلم)عن رَجُلٍ امرأته تطلیقات جمیعاً،فقام غضبان،ثم قال : (أیلعب بکتاب الله عزوجل وانا بین أظهرکم؟!)حتی قام رجل فقال:یارسول الله الا اقتله؟!)رواه النسائي.

ئەلبانی لە تەخریجی(مشکاة المصابیح)چاپی سێیەم،بیروت_١٤٠٥ھ ی(المکتب الاسلامی)_٢/٩٨١ ،بە (ضعیف)ی داناوە.

کەچی لە پەرتوکی(غایة المرام تخریج أحادیث الحلال والحرام)چاپی(المکتب الاسلامی)ی ساڵی(١٤٠٥)واتە هەمان ساڵ وچاپی(مشکاة)،لەلاپەرە(١٦٤)بەحەدیسی(٢٦١)هێناوییەتییەوەودەڵێ (صحیح)ە.

٢_حەدیسی(الجمعه حق واجب علی کل مسلم....)

ئەلبانی لە (مشکاه المصابیح)(١/٤٣٤) بە (ضعیف)ی داناوە،کەچی لە (إرواء الغلیل)٣/٥٤/ژمارە٥٩٢ دەڵێ (صحیح)ە.

٣_حەدیسی دایکمان عائیشه(رضی الله عنها) که دەفەرموێ(من حدثکم أن النبي (صلی الله علیة وسلم)کان یبول قائماً فلا تصدقوه ماکان یبول الا قاعداً))رواه احمد وغیره،جا ئەلبانی موتەناقیض ،لە تەخریجی(مشکاه المصابیح)_١١٧/١)بە (ضعیف)ی داناوە،کەچی لە (سلسه الاحادیث الصحیخه)_٣٤٥/١_ژماره٢٠١بە( صحیح)داناوە.

ئەمانە نمونەی مشتێکن لەخەرواریێ،گەر بێت و تێکگیرییەکانی (ئەلبانی)بنوسینەوە ،خۆی لە خۆیدا پێویستی بە پەرتوکێکی سەربەخۆیە،بۆ گەرێرەوە سەر پەرتوکی(تناقضات الالباني الواضحات)ی سەید سەقاف.

# گوتەی کۆتاییمان لە کۆتایی گوتەمان

خوێنەری سەنگین:

بەخوێندنەوەی ئەم پەرتوکە بۆت روون بویەوە کە ئەلبانی کێ یە،شارەزای بیروباوەری بویت بەرامبەر خوای گەورە ،کە بۆت دەرکەوت بێ رێزە بەرامبەر خودا و موجەسیمەیە ،پێویست ناکان لەمەودوا لە ئەلبانی و شوێنکەوتوانی فێرە خواناسی و خواپەرتسی ببیت،چونکە ئەوانە فێری پەرستنی خوایەکت دەکەن کە لەلایان لاشەیە و پێویستی بە دانیشتن لەسەر عەرش و شوێن و مەکان هەیە.

کەزانین بۆچونەکانی ئەلبانی چۆنە بەرامبەر حەزرەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)،وەبۆت روون بویەوە کە ئەلبانی دوژمنی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)خزمەتکاری ناحەزانی گەورەی مەخلوقاتە ،کە بۆت روون بویەوە ئەلبانی حەزرەت(صلى الله عليه وسلم)بە گومرابوو دادەنێت، کە بۆت روون بویەوە ئەلبانی دژی سەلاْواتە،ئەوکەسانەی ئاهەنگ دەگێرن بەیادی حەزرەت(صلى الله عليه وسلم)بە گاورەکان دەشوبهێنێت،پارانەوە بەخاتری حەزرەت(صلى الله عليه وسلم)بە بیدعە و شیرك دائەنێت،پێوست ناکان لە پاش ئەمە ،لە ئەلبانی و شوێنکەوتوانی فێرە خۆشەوستی و

ڕێزی حەزرەت(صلی الله علیه وسلم)ببیت،چونکە ئەوانەفێرت دەکەن کە :پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)کوری کافرانە!!

هەروەها کەزانین ئەلبانی لە شیعەکان خەراپترە بەرامبەر دایکی ئیمانداران ،وە زماندرێژی دەکاتە سەر ناموسی ال و بەیتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)گەر حەزدەکەیت دینداریت بە هەوا دابچێت ،ئەوە بۆخۆت شوێن بکەوە!!

خوێنەری سەنگین:

بەبەڵگە بۆت روون بویەوە کە:ئەلبانی (هادم الدین والسنه)بوە نەك(ناصر الدین والسنه)!!!

بۆت روون بویەوە کە ئەم (ئەلبانی) دۆستی ئیسرایل و دوژمنی موسڵمانانی فەلەستین بوە،خزمەتکار و نۆکەری کوفری سەهیۆنیەت بوە ،جا گەر غیرەتی ئیسلامی و بەسۆزی بۆ کۆشش لە پێناوی خوا،نابیَ شوێن ئەلبانی بکەویت.

خوێنەری سەنگین:

بەبەڵگەوە بۆت روون بویەوە کە گشت دروشمەکانی وەك:فەرموودەناس و ئیمامی سەردەم و نوێکەرەوەی دین..هتد درۆن و بیَ ناوەرۆکن ،پلەی زانییاری ئەلبانیمان لە فەرموودەناسیدا بۆت روونکردەوە ،بۆت سەلما کە ئەم ئەلبانییە خیانەتکار و مودەلیس و موتەناقیضە،هەر فەرموودەیەك لەگەلّ مەشرەبی ئەو گونجابێت ،(

صحیح) یان ( ضعیف)ی كردوه با لە راستشدا پێچەوانەبن،بۆیە دروستنیە بەهیچ شێوەیەك بۆ فەرمودەناسی ئاور لە ئەلبانی بدەیتەوە.

داواكارین لە خوای گەورە،بەخاتری پێغەمبەری نازدار(صلی الله علیە وسلم)رێنومایی گشت لایەك بكات بۆ حەقیقەت،وە بەگەورەیی خۆی رێبازی ئەهلی سوونە و جەماعە بپارێزێت ..امین اللهم امین .

بەم شێوەیە لە كۆتا پاكنوسی ئەم كتێبە بومەوە لە بەرواری

رۆژی سێ شەممەی

٥/مانگی پیرۆزی لە دایكبونی رسول الله (صلی الله علیەوسلم)/

ساڵی ١٤٣٢ كۆچی

١٩/رێبەندان /ساڵی ٢٧١٠ كوردی

٨/شوبات/ساڵی ٢٠١١ مەسیحی

تراب اقدام العلماء

عبدالله فائق الحاج عبدالرحمن العالآيي

اربيل _ اقليم كوردستان العراق

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

وصلى الله على سيدنا ومولانا محمد وعلى اله

وصحبه وسلم

# سەرچاوەکان

## أ_ کتێبەکانی ئەلبانی.

(أ)

آداب الزفاف ، الألباني ، ط الأولى ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض.

الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة ، الألباني ، المكتب الإسلامي ، بيروت .

أحكام الجنائز وبدعها ، الألباني ، المكتب الإسلامي ، بيروت .

(ت)

تحذير الساجد ، الألباني ، ط الثالثة ، المكتب الإسلامي ، بيروت

تمام المنة ، الألباني ، دار الراية ، الرياض .
التوسل أنواعه وأحكامه ، الألباني ، تنسيق محمد عيد العباسي ، ط الأولى الشرعية ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .

(ح)

الحاوي من فتاوي الشيخ الألباني ، أبو همام المصري ، ط العلمية ببنها ، مصر .
حياة الألباني وآثاره ، محمد إبراهيم الشيباني .

(ر)

رسالة كيف يجب علينا أن نفسر القرآن الكريم ؟ الألباني ، ط الأولى ، المكتبة الإسلامية ، الأردن .

(س)

سلسلة الأحاديث الصحيحة ، الألباني ، ط الاولى ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .
سلسلة الأحاديث الضعيفة ، الألباني ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .

سلسلة أشرطة الهدى والنور ، للألباني .

سنن ابن ماجه .

سنن أبي داوود .

سنن الترمذي .

سنن الدارمي .

السنن الكبرى للبيهقي .

(ص)

صحيح السيرة النبوية ، الألباني ، ط الأولى ، المكتبة الإسلامية ، الأردن .

(ف)

فتاوى الألباني في المدينة والإمارات ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، دار الضياء ، مصر .

الفتاوى الاسترالية للألباني ، إعداد عمرو عبدالمنعم سليم ، دار الضياء ، مصر .

فتاوى الشيخ الألباني ، عكاشة عبدالمنان ، ط الثانية ، دار الجيل ، بيروت .

الفتاوى الكويتية للألباني ، جمع عمرو عبدالمنعم سليم ، ط الأولى ، دار الضياء ، مصر .

(ك)

كتاب الشيخ الألباني ومنهجه في تقرير مسائل الاعتقاد ، محمد بن سرور شعبان ، ط الأولى ، دار الكيان ، الرياض .

(م)

المجموع في ترجمة العلامة المحدث الشيخ حماد بن محمد الأنصاري ، عبدالأول الأنصاري .

مختصر صحيح مسلم للمنذري ، تحقيق الألباني ، ط الثالثة الجديدة ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض .

***ب_سەرچاوە سەرەکییەکان***

١_المضحك المبكي من فتاوى الالباني،عادل كاظم عبدالله، الطبعةالأولى

١٤٣٠هـ / ٢٠٠٩ئەم کتێبە سەرچاوەی سەرەکییە.

٢_سلسلة الهداية(تبين ضلالات الألباني)شيخ الوهابية المتمحدث ، جمع بعض تلاميذ الشيخ عبدالله الهرري،الطبعة

الثالثة،١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م،شركة دار المشاريع الخيرية.

٣_تناقضات الالباني الواضحات(فيما وقع له في تصحيح الأحاديث وتضعيفها من أخطاء وغلطات)،بقلم السيد حسن بن علي السقاف،الطبعة الحادية عشر،١٤٢٨هـ /٢٠٠٧م،دار الامام النووي،الاردن.

٤_جزء فية الرد على الألباني،المحدث الشيخ عبدالله الغماري المغربي،الطبعة الثانية،١٤٢٤هـ/٢٠٠٤م،دار المشاريع للطباعة والنشر والتوزيع.

٥_البشارة والاتحاف بما بين ابن تيمية والألباني في العقيدة من الأختلاف،السيد حسن السقاف،الطبعة الثالثة،١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م،دار الامام النووي،الاردن.

٦_مجموع رسائل السقاف،الطبعة الثانية،١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م،دار الامام الرواس،بيروت _لبنان.

٧_وصول التهاني بإثبات سنية السبحة والرد على الالباني،العلامة محمود سعيد ممدوح،الطبعة الخامسة،دار الامام الرواس.

٨_علماء ومفكرون_محمد المجذوب.

*٩_ الشيخ الألباني ومنهجه في تقرير مسائل الاعتقاد ، محمد بن سرور شعبان ، ص ٢١٦ ، ط الأولى ، دار الكيان ، الرياض.*

١٠_نصرة التعقب الحثيث على من طعن فيما صح من الحديث،لخادم علم الحديث الشريف(الشيخ عبدالله الهرري)،الطبعة الثانية،١٤٢٢هـ/٢٠٠١م،دار المشاريع الخيرية.

١١_التجسيم والمجسمة وحقيقة عقيدة السلف في الصفات الإلهية ،عبدالفتاح بن صالح قديش اليافعي ،الطبعة الأولى،١٤٣١هـ٢٠١٠م ،مؤسسة الرسالة ناشرون.

١٢_قاموس شتائم الالباني_السيد حسن السقاف.

١٢_جیهاد لەئیسلامدا چۆن تێی دەگەین و پێی هەڵدەستین،د.محمد سەعید رەمەزان بوتی،وەرگێرانی شیخ محسن خالید موفتی،چاپی یەکەم ،٢٠٠١،چاپخانە زانکۆی سەلاحەدین.

١٣_ئاژاوەی وەهابییەکان،ئامادەکردن و وەرگێرانی عبدالله

فـــــائق عالّلایی،چـــــابی یەکـــــەم، ٢٠١٠م،چـــــاپخانەی شەهاب،هەولـێر.

١٤_چەند گولێك لـە گولزاری ئیسلام پێـشکەشە بەگـەنجی نەونەمام،عەلـلامە عبداللە عبـدالعزیز هەرتەای،چـابی چـوارەم ، ٢٠١٠م ،چاپخانەی(رۆژهەلات)،هەولـێر.

پێرستی بابەتەکان

بـەلاّم ئـەلبانی:کـە خـۆی بـە (موحـەددیـث) دەزانێــت لــە ڕای ئیجمـاعی شـەرعی لای داوە،کـە پێـی ئاگەدارنییـە، بۆیـە بەرامبـەر هــەموان بـێ شـەرمانە گـوتی : فەلەسـتین بـەهۆی ئیـسرائیلەوە ، بووەتـە وولاّتـی کـوفر و حــەرب، بۆیــە پێویــستە لەسـەر هــەموو خەڵکەکــەی بــەجێ ی بهــێڵن و کۆچــی لێ بکەن!

د.محمد سعيد البوطي

ئــەی لاوی موســڵمان:جــەنابت خــۆت بڕیاربــدە: ئایــا (البــانی) شــیاوی ئەوەیــە: ئێمــە شــوێنکەوتەی بــین و تــەنها پەرتــەوازە و تێکــدانی ڕیــزی موســڵمانانی لێ فێــرببین و واز لە زانایانی (السلف) بهێنین؟

کەسـێك ئـەم جـۆرە تۆمەتانـە بداتـە پـاڵ زانایـانی (سـلف) چـۆن دروسـتە بـاوەڕی پـێ بکـەین کـە دەڵـێ: ئـەم حەدیـسە (ضـعیف)ە؟

گوڵزاری ئیسلام، لا ٨-٩بەدەستکارییەوە.

م. عبدالله هەرتەلی

